

# کاروانی خەیاڵ

بەشێک لە هەڵبەستەکانی

خالد حاجی (هێدی)

بەناوی خوای بەتەنێ

دەڵێی ئێمە لە گڕو خانەق ئەستوورترم
لێ مەدە دا ئێمە لە سەر داوا رواکەم سوورترم
دەڵۆزی ئێمە بە [illegible] جیا دەکەم داد عوو
بوو ردموو [illegible]

هەمین ١٩٢٢

٢١٨٤

# کاروانی خەیاڵ

## بەشێک لە هەڵبەستەکانی

خالد حسامی «هێدی»



# کاروانی خەیاڵ

بەشێک لە هەڵبەستەکانی خالد حسامی «هێدی»

کتێبی : کاروانی خەیاڵ (بەشێک لەشیعرەکانی
خالیدی حیسامی"هێدی")
شاعیر : خالیدی حیسامی "هێدی"
لەبڵاوکراوەکانی : ناوەندی بڵاوکردنەوەی
فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی
ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەیووبی
تیراژ : ۴۰۰۰
ساڵی بڵاوبوونەوە : چاپی یەکەم ۱۳۶۴
ناونیشان: ارومیە ، صندوق پستی ۷۱۷،تلفن ۳۵۸۰۰

# فهرست

## پاشماوه‌ی فهرست



ئەووێنە بەبێ من کەلەلای ئێوە ئەمێنێ

بۆ بیرەوەری باشە ئەڵێن خەم ئەڕەوێنێ

مەڕوانە کەوا ڕوم گەشە وەک پەلکی خەنەم من

جەرگم پڕە لەخوێن و سەرم سەوز ئەنوێنێ

بسم الله الرحمان الرحيم

سەری نامەم بە ناوی تۆ خوایە
کە بێ ناوی تۆ نامە بێ نەوایە
خوای بەرزو نەوی و هەورازو لێژان
خوای رۆژی دەری پیتۆڵ و گێژان
خوای تەنیای دیارو، نادیاران
خوای میرو، بەلەنگازو (١)، هەژاران
خوای من، ئەی خوای دڵشادو دڵتەنگ
خوای بێیارو بێ هاڤاڵو بێ رەنگ
خوای بینا، خوای زانا بە حاڵان
خوای بێ یاوەرو، روت و، رەجالان
بەچاو لێک نانێ لێک هەڵدێنی چاوێ
بەهێزە دەستی تۆ هەوکاری ناوێ
ئەگەرچی حازرو ناظر لەگشت جێی
خەیاڵ ناگاتە ئەوجێیە کەتۆی لێی
وجودی تۆ ئەگەرچی رون و سورە
لەرادەی دەرکی زانستیش بەدورە

---

(١) بەلەنگاز: فەقیر، نەدار.

خوای هەستو، وتەو، بیرو، خەیاڵان
خوای کوێرو، کەڕو، گێژو، گەواڵان
بەجیرەی بێ‌منەت تێرو، بە ئێرو
لە سەرخوانی خوابیت مارو مێرو
بە تێربون‌و نەبونی موچە خۆران
لەدەرکی تۆ نیە تاران و تۆران
بەتۆدەکرێ بنیری تیشکی تاوێ
کەبێ، گیانی وەبەر، بێ‌گیانی باوێ
لەتۆرایە تریفەی مانگ لە شەودا
ئەتۆی بێدار و باقی‌تر لە خەودا
تەڕو پاراوی تۆن ئەزمان لەزاران
لەدەس‌تۆدا دڵی یارو نەیاران
بەئەمری تۆ هەور بارانی دێنێ
بەسەر چۆڵ‌و چیادا دەیڕژێنێ
بەویستی‌تۆیە خێریان لێ‌دەبارێ
کەشی هاوین‌و پاییزو بەهارێ
ئەتۆ وات‌کرد کەزستانان بەسەبرن
ئەگەر زستان لەژێر بارستی بەفرن
خوایە ئەی‌خوای جوان‌و دزێوان
خوای ئەگریجە زەردو کولمە زێوان

خـوای سینـەسپی‌و نەرم‌و دڵی سەنـگ
خـوای بسک‌و کەزیی شۆڕو قەدی تەنگ
من ئەوڕۆ چم ئەوێ لێـت هـەر زمانـی
زمانـێ بێ کەپەسنـی تـۆ بـزانـێ
زمانێـک بـێ کـەزانی زارە کـارم
بـەهاسانـی وشـە باوێتـە زارم
زمانێـک بـێ لەگەڵ ئەو واتـە ئۆگـر
کـە "تەنیا تۆ خوای ئیتـر کە سی تر"
خەیاڵی مـن منـاڵـێ بـێ زمـانـە
دەنـا یـادی تـۆ ئـاوێتـەی دڵانـە
وتـاری زۆرە بیلـێ‌و چەشنی منـداڵ
قسـەی بۆنـا یـە دەیکاتـە گرڕ و گـاڵ
لـەحـێ یەک پەسنی تـۆ زانـا نەزانێ
چ دێ ئیتـر لـەدەستـی بێ زمـانـێ
دڵێکم پێ بـدە دەریای ئەویـن بـێ
بەریـن بێ ، بێ برین بێ ، ئاگریـن بـێ
دڵێک بێ خوێـن نەبێ ، دڵ بێ لەسینـە
دڵێ بێ ژەنگ‌و ، گەردو ، بوغزو کینـە
بـە جـارێ زۆری هێنـا دەردە داری
دەس‌و هە نگاوی شل کـرد لەش بەباری

ئیتر با تەم لەبەرچاو نارەوێنێ
روانگەی دیدە هەردێو کورتی دێنێ
لەئالۆزی وتارم را دیارە
کەچی پێم کردوە دەردو پەژارە
بنێرە خوایە هەتوانی برینم
کە ژانیدڵ بڕی خۆشی لەژینم
ئیتر ئەوجار منو ژێنێکی بێوەی
ئیتر جێی ئاخو داخان بگرێ ئۆخەی
خەمێکم پێمەدە زێدەی توانام
خەمت خوایە لەتوانا زێدە پێدام
لەبەر بێچارەییم هەنگاو بەهەنگاو
بەسەرشێواوی دەڕوانن سەروچاو
دواقوناغی رێگەم دەرکی تۆیە
خوا بگرەدەسم لەو هاتوچۆیە
بەزەت پێم دابێ روناکی بخە رێم
کە بەو رێ راستەدا رزگاربمو بێم
ئەگەر کار کەوتە بەخشینی خوایی
بەگشت پاڕانەوێک دێنی دوایی
بەڵام کەی تامی مەرگم پێ دەچێژن
لەکوردوستانی رزگارم بنێژن

لەفیردەوساو، لەکوردوستانی زەنوێر
لەشوگیان بەشبن و سەیران بکەن تێر
بەئەسپایی دێ دەنگێ نادیاری
دەچرپێنێ بەگوێما جار بەجاری
ـ کە رۆیی کاروان و پای تۆ لەنگە
لەشت پێ ناچێ گیان دەرکە درەنگە
تەمەن هەرچی هەبو رۆیی لەخەودا
ئەبینم ئێستە زۆر کەم ماوە مەودا
لەئەستۆم هێندگرانە باری تاوان
چەماون پشتم و ئەژنۆم لەتاوان
بەتەنیایی لەرێگەی دورو بێ بن
تەمام تەنیا بەلوتفی تۆ هەیەمن
نیە تۆشەم لەروحمی تۆ زیاتر
کە لەوروحمە نیە هیچ تۆشە چاتر
نەچارێکم هەیە ئیتر نەرێی دی
بەرەو قاپیت ئەوە دیم هێدی "هێدی"

عظیمیە کەرەج ٦٤/١/٨

# "دایک و کور"

بەرۆژێکی گەلێک باران و سـەرمـا
نـەهەر سەرما سەرم لەورۆژە سوررما
لەگوندێک هەڵکەوت رێم کەوتە ماڵێک
چ ماڵێک هەروەکو خەون و خەیاڵێـک
گەلێک ماڵێکی گەرم و پاک و خـاوێن
کوروکیژێک لـەوێ وەک توڵی لاوێـن
کوڕ و کچ پێکەوە خوشکوبـرا بـون
دەگەڵ دایکێک لەناو ئەو ماڵـەدابون
هەمو هێندە دڵئاوا بـون و روخۆش
کەماندوبونـی رێگـەم کـرد فەرامۆش
لەپاش ماوێکی کەم دیتم "گەلاوێـژ"
لەگەڵ "سمکۆی" برای کەوتە وتووێژ:

* * * *

براکەم گەرچـی تۆ تاقـە بـرامـی
هومێـدی رۆژی رەش پشت و پـەنامی
بـەتـۆ رونـە گلێنـەی چاوەکـانـم
لەتـۆ رایـە هەمـو خۆشـی ژیانـم

گوڵی هیوای لەباغی ژینی مندا
لقی سەروی لەناو پەرژینی مندا
هەتا ئەورۆژە دەم نێژن لەگڵدا
برای و خۆشەویستیت هەر لەدڵدا
بەڵام ئەو داخە دەمکوژێ نەهێنی
برای‌دیم وا لەسەنگەر تۆ لەوێ نێ
گەلاوێژ لەو وتەی خۆی کەوتە گریان
دەگریاو دەی‌گوت و فرمێسکی دەرژان:
لەوێ‌نی تاکو تۆش چاوت لەوی‌بێ
لەپارێز بردن و هات‌و هەوی‌بێ
لەوێ‌نی تۆ لەکاتی شەو نخون دا
لەنێوئاگرو بڵێسەی ڕۆژی ڕون دا
لەوێ‌نی‌تۆ هەتا هاواربکا لێت
براپێش مەرگەکەی دڵسۆزی هاورێت
لەدوژمن ڕاخوڕێ وەک شێری سەرمەست
لەرێی گەلدا ڕوحی باوێتە سەردەست
تەماشای تۆ بکاو دڵ خۆش بکا پێت
سەری دوژمن بەگەپ باوێتە بەرپێت
حەیف سمکۆ کەلاوێکی وەکو تۆ
بەجێ ماوی لەئاواڵ و برای خۆ
سەرم هەڵنایە ئیترمن لەشەرمان
هجومی تانە هیند ئەکرێتە سەرمان

لەناوگوندا ئەگەر ڕۆژە ئـەگەر شـەو
لەگەڵ منـدا هەموگاڵتەی ئەم وئەو
ئەگەرتـۆ حەزئەکـەی لێـرە بمێنـی
لەلای دایکـم بـە تۆ بۆ خەم ڕەوێنـی
لەجێی تۆش من بچم بەوشەرتە سمکـۆ
لەڕێی گەلدا چیـە فەرقی من و تۆ؟

* * * *

وەڵامی داوە سمکـۆی دڵ بریـندار
برا قوربانی تـۆ خوشکـی وەفـا دار
ئەوەی وا تـۆ منت پێ گـرتە لۆمـە
ئەوە ئەرکـی گرینگی شـانی خـۆمـە
دەهێـزم دا هەیە بـەو ئەرکـە هەستم
لەڕێی رزگاری تادەمـرم نەوەستـم
بەڵام من هەر پەژارەی تۆمە یەکجار
دەگەڵ ئەوپیرە دایکـە بێکەس و کار

* * * *

هەتا ئەوکاتە هەر بێدەنگ بو"ڕوناک"
کە وای بیست هاتەپێش ئەو دایکی دڵ پاک
سەروپرچی سپی وەک بەفـری بـێ گەرد
وتەی کـاری دەکردە سەردڵی بـەرد
بەزەردەو پـێ کەنین ڕوی کردە سمکـۆ
گوتی: من تێگەییم ڕۆڵـە قسـەی تـۆ

کورێک بۆ نیشتمان خوێنی نەرێژێ
لەرێی رزگاریا مەینەت نەچێژێ
لەدوژمن خوێنی بابی خۆی نەسێنێ
نەبونی باشترە با هەر نەمێنێ
ئەوانەی بۆ وەتەن چونە کەژو کۆ
هەمو دایکیان هەیە سمکۆ وەکو تۆ
لەشاخان شین نەبون بەردی چیانین
کەس و کاری مەن و لێمان جیا نین
گرانە دەردی ژێردەستی و زەلیلی
برۆ بمرەو مەژی ساتێ بەدیلی

* * * *

هەتاو تازەی گزینگ دابو لەئاسۆ
کورودایک کەدەستیان کردە ئەستۆ
خەیاڵ بو، دیدەبو، من‌بوم سەری‌گێژ
نزای‌دایک دەگەڵ زەردەی گەلاوێژ
سەری‌کێشابو رۆژو تا توانی
ئەویش دەودیمەنە جوانەی روانی
برۆ تێکۆشە بۆ ئەو ئاوو خاکە
حەڵاڵت‌بێ کورم ئەو شیرە پاکە

٩٦٥/١٢/٣
دەنگی کوردوستانی عیراق

## "بازو کەو"

لە مەڵبەندێکی خۆشی کوردەواری
سەرەوژور بونەوە خێڵ بۆ هەواری
لەداخی بەفرو زستان و کرێوە
چیای ڕازاندبۆوە خاکە لێوە
لەبەردەشتا کراسی مەخمەری شین
لەئامێزی هەڵاڵە و یاس و نەسرین
تەماشای چت دەکرد خوارو سەر و ژور
سەری لێک دابو شللێر و گوڵی سور
وڵات خەملیبو بەو چەشنە سەراسەر
بە خاش خاش و گوڵی بەیبون و شەست پەر
لەناو ئەو دیمەنە سەوزو جوانە
کەجێی درکاندنی هەستی دڵانە
لەزەردێکا کەوێکی قۆز و نەخشین
سکاڵای بو لەگەڵ بازێکی تێبین
سەرەڕای ئەو سروشتە دڵ ڕفێنە
وەکو زامداری "کەو" دەی کرد ورێنە:

* * * *

دەغیلت بم مەلی پسپۆڕ و چازان
مەلی تەردەست و وریاو ژیرو تەڕلان
دەژین دا بۆچی وا چارە ڕەشم من؟
لەخۆشی و کامەرانی بێبەشم من؟
ئەمن روح دادەنێم بو خاوەنی خۆم
لەبەرچی ئەو وەفایێکی نیە بوم؟
وەرە تۆخوا سەیرکە خاڵ و میلم
لەسەر ئەو دیمەنەشڕا وا زەلیلم
هەمو ڕۆژێ دەگەڵ کازیوە ئەنگوت
دەچم بۆڕاوی"مێڕۆژ"(١) وسیاسوت"(٢)
لەقاسپەی من هەزار بارو کەوی پیر
لەداوی خاوەنم دا بونە نێچیر
سەعاتێک ناسرەوم بێ خواردن و خەو
کە ئەو تێربێ لە گۆشتی ناسکی کەو

(١) و (٢): ڕاوی کەو لەوەختی جۆزەردان "مێڕۆژ" و لە هەوەڵی بەهاردا سیاسوتی پێئەڵێن. لەڕاوی مێرۆژدا "ماکەو" دا ئەنێن ئەخوێنێ و "نێرەکەو" دێتەسەری کەئەوکاتە ماکەوی تر کورکە و لەسەرهێلکەیە. ڕاوی سیاسوت لەهەوەڵی بەهاردا یە نێرەکەو دەخوێنێو نێرەکەو دێتەسەری کە لەگەڵی بەشەر بێو ماکەوی لێ بستێنێ.

نەبو جارێک لەسیپەیدا بخوێنم
لە گرمەی تاپڕی دەنگ دانوێنم
لەماڵێ سازو سەمتورە غورەی من
نشەی ڕاوچی دەبزوێنێ گوڕەی من
لەسەر ئەو حاڵەرا بێ قەدرو حورمەت
قەفەز جێگای منە بێدان و خزمەت
ئەگەر ڕۆژێکی کەو نەکرێن قەلاچۆ
ئەبێ لێم دارنن باڵو پەڕو پۆ

* * * *

وەڵامی داوە"بازی" کۆنە ڕاوکەر
کە تاوان هەر لەتۆڕایە سەرانسەر
ئەتۆ خۆت بویە گورگی مێگەلی خۆت
ئیتر کێ بێت و دڵسۆزی بکا بۆت
دەخوێن دا سوربوە دندوکی ئاڵت
ئەبێ بیگریە ئەستۆی خۆت وەباڵت
براکەت بانگ ئەکەی بیخەیتە نێوداو
بەڵام دوا ڕۆژی خۆت ناخەیتە بەرچاو
دەرێژی خوێنی خزمی خۆت و بۆخۆت
دەدەی دەستی پەشیمانی لە ئەژنۆت
کە بۆ فەوتانی هۆزت تێ دەکۆشی
دەژین‌دا چۆن ئەبینی خێرو خۆشی
کەسێک بۆخۆی ئەوە شەرت و بەقای بێ
ئەبێ چۆن دوژمنی بۆئەو وەفای بێ

دڵت ناسوتێ بۆ جوجکی برای خـۆت
ئـەتۆش پێویستە بی‌بینـی سەزای خۆت
لەبەر ئەو راوە دەگرێ حورمەتـی تۆ
دەنا ئەو نایەوێ خاڵ و خەتی تـۆ
هەمو دەشت و چیـا پاوانی تـۆیـە
ئەگەر تێ‌یدا نەژی تاوانی تۆیـە
بەسەربەرزی لـەناو هێلانـە مردن
نەوەک تۆ خرمەتی بێگانە کـردن

١٩٦٥/١٢/١٠
دەنگی کوردوستانی عیراق

## "ئاگری تۆ"

ئەی وەتەن تەنیا نە هەرمن بۆ تۆ وا سەوداسەرم
تیشکی ڕۆژیش جێی لەبەر کۆیلەت نیە دەوروبەرم
تۆ لەدەس بێگانەدابـــی چارەنوسی ئەو گەلە
هەڵمەت و قوربانی دانەو ڕشتنی خوێنی گەرم
ناحەزیتۆ پێ لەسەر گۆڕی شەهیـــدان دابنـــێ
کێ یە باوەڕکا کە دەس لەو خاکو خوێنە هەڵگرم
دوژمنت چیدیکە بـــا ئاگر لەماڵـــم بەر نـــەدا
من لەسایەی خۆشەویستی تۆوە هەر خۆم ئاگرم
سەد پەژارەو بەرهەڵستو سوێرو تاڵیم بێتە پێش
گەرلەڕێی ڕزگاری تـــۆ لادەم بزانـــە کافرم
خۆم بە شانازی بەلا گەردانی سەربەرزیت دەکەم
تیخی خۆی دابنێ دوژمن بۆ مەتاڵت حازرم
سەر لەسەرشانم وەکـــو بارێکە کەڵکی چی هەیە
گەردەرێی تۆدا نەچێ ئەوبارە قەت هەڵناگرم،،
من بەبیرو باوەڕو دوژمـــن بەتانک و تۆپەوە
کێو بەکێو ڕاوی دەنێم واتە گەڵێک ئازاترم

هەر بەهیوای ڕۆژی ڕزگاریت ئەژیم و ڕونە لێم
تا بەدەستی خۆم نەنێژم دوژمنی تۆ نامرم
من دەرێی سەربەستی تۆدا بۆ هەمو پیلانی ڕەش
دڵنیابە هەر کورە پێش مەرگە کەی ناو سەنگەرم
ئەو کورەی هێزم لەشیری تۆوەیە و ڕۆژی هەرا
جێی لەناو جەرگو هەناوی دوژمنت داخەنجەرم
منکە گاڵتەم دێ بەمردن سەیرە گەرتۆ شادنەبی
تۆدەبێ هەر سەرکەویو کۆسپت لە سەرڕێ لابەرم
دوژمنت هەرفێڵێ بیکا نەخشی سەرئاوە و ئەمن
پیرە دارێکم کە بەوبایانە هەرگیز نالەرم
نابەزم هەروەک بەڵێنم داوە یان ڕزگاری تۆ
یان هەمو ئەو شیوو دۆڵەت پڕدەکا خوێن و تەرم
ئەی وەتەن هەرناوی تۆ وردی زمانمە بۆیەوا
هەروەکو دەشت و چیاکەت کەسکوسورە دەفتەرم

١٩٦٦/٣/٨
رادیو دەنگی کوردوستانی عیراق

# "خدرەشێت"

زۆر کـەس هەیە لـەو دنیایە
بی‌بینـێ بێـزی هەڵ دەستێ
خۆ ڕاستە شێت بـێ ئەنوایە
شێتـی نەک هەر زەرەر نیە
من شێتێکی گێـژو هێـرم
لـەماڵێدا ژنـم ، خـەسوم
هەر دەم بینـن خاوو خێزان
کوڕەکەی خـۆم ئەو بچکۆلە
کێ بخلیسکـێ لـە حەسارێ
هەرچـی نـاشیرنو کـرێتـە
منیش لەپێشـدا وا نـەبـوم
ئەگەر بـە شێت ناوم نەبەن
ئیتـر جـوابیان نادەمەوە
ئێوارێ ، سبـەینێ ، شـەوێ
لێکـدا لێکـدا ژنو خەسوم
یەکیان لەو بەر یەکیان لەوبەر
قەت ناهێڵن سـەرم هەڵێ

کەیفی دەگەڵ شێت هەر نایە
دەچێ دور لـێی ڕادەوەستێ
بەڵام من خـۆم لەلام وایە
لەشێتی باشتـر هـەر نیە
بێجگە لەوەش، شـەلم گێرم
بە شێتەشێت دەکەونە دوم
لێم دەکەن بەچەپڵـە ڕێـزان
بانگم دەکـا "بابە حـۆلە"
جنێو بۆ من دادەبـارێ
دەڵێن ئیشـی "خدرەشێتـە"
ئێستـە بـەوناوە ڕاهاتوم
ناوێکـی ترم لـێ هەڵدەن
هـەر لاشیان لێ ناکەمەوە
لەسەرنانی ، وەختی خـەوێ
وەک کەو ئەخوێنن بەرەوڕوم
ئیتـر سـەرم داوێنە سـەر
ئەم لێ‌یبرا ئەویان دەڵـێ

خۆلە کەی نان خواردن وایە     یان هێرە لاچۆ لەو لایە
یەک ئەڵێ چڵمت بسترە     بۆ بەدایم لوتت پڕە
یەک ئەڵێ قسە نازانێ     بۆ ئەدوێی لەگەڵ میوانێ
حەیای ئێمەش ئەبەی گێژە     ئەو زبڵەی بەرە بێ ڕێژە
ئەوی قەت منی نەدیوە     وەک کێچ دەکەوڵم خزیوە
دەگەڵ: فیتوو، هێ هێو، هۆهۆ     جاڕزیان کردوم چەقە سرۆ
ئەوانەی وا بە مل هوری     "شێت"یان بەسەر مندا بڕی
جاچۆن دەس لەمن هەڵگرن     ئەوان خۆ لەمن شێت ترن
زۆریش هەوڵ ئەدەم تێناگەن     دەڵێم بەڵکو لام لێ لادەن
تورەبم، ئەڵێن: چی بوە؟     "شێتە خۆی هەڵ مساندوە"
پێ بکەنم، لەهەمو لاوە     پێم ئەڵێن" لەسەری داوە"
هەرچی بیکەم منی ڕەبەن     ئەوان قسەی خۆیان دەکەن
هەرنەم توانی بەنیان بادەم     منیش خۆم نارەحەت! ناکەم

* * *

پارەکە ڕۆژی جێژن بو ،     ماڵم پڕ لە پیرێژن بو
خێزانو خەسوم دوبەدو     هەردوک خۆیان ساز کردبو
دەچونە سەردانی خزمان     هەردەمام منی بەستەزمان
پێیان قاربو منیش بەرن     منداڵیشم پێ هەڵ گرن
هەردوک جلکی نوێیان لەبەر     یەکی تاسێکی زێر لەسەر
خەسوم شانەی لەدەستابو     لەبەر ئاوێنە وێستا بو
بانگی کردم: لەکوێی خۆلە؟     بۆ چویە ئەو ژورە چۆلە؟
گوتم: واڵڵە خاتونی خۆم     ئەوە قاپ و کەوچک دەشۆم
گوتی: وەرە، ئیتر ئەو ڕۆ     ئاقڵ بە کۆلانان مەچۆ

وامن و کیژەکەم ئەڕۆین
تۆش خۆت سازکە ئەو نەورۆزە
بچۆ جلو جۆرت بێنە
شێتو شێتبازی وەلانێ
لەپێوە تا تۆقی سەرم
هەربۆ تەشقەڵە بە ئەنقەست
—ئای ئای هێرە ئەوە لەکوێی
بۆ نازانی باش راوەستی
لوتت هێندە هەڵ مەهێنە
ئیتر بۆ هەر ماڵێ کە چوی
وەک خەرتەلی هەڵمەنیشە
خۆت وادانێ کەتۆش شتی
هێرە ئیتر نەچی لەوێ
کێ خزمو دەراو سێما نە
ماڵی خاڵم ، خوشکە پەریم
چوزانم ، هەموم نوسیوە
نەکەی لێت تێکچێ وریابە
ئەوی لەتۆ گەورە ترن
بەڵام بۆ گچکەوا نیە
شیرنی تەنیا دەنکێک بخۆ
هەرچی خواردت مڵچەتنەیە
شۆکۆلاتیش ئەوی هەبن
جێژنانەش لەکەس وەر نەگری

نیوەڕۆش لای ئەوان ئەخۆین
ئەت نێرمە جێژنە پیرۆزە
وریاشبە شتی مەشکێنە
ئەوەش جێژنانەکەت ، هانێ
جلکی نوێیان کردە بەرم
خەسوم پشتێنی بۆم دەبەست:
بۆ هەربەولاو بەولا دادێی
دەڵێی نەمەیوی هێند سستی
دەست لەگیرفانت دەرێنە
هەر لەدەروازە ئاوا بوی
بچۆ سەرکورسی دانیشە
تێ گەیشتی چم پێ گوتی ؟
پەلە وەجلکت بکەوێ
ئەوکاغەزەش لیستەی وانە
لەوێوە ، ماڵی کاک کەریم
دەزانم هیچت نەدیوە
جێژنە پیرۆزەیەو دابە
دەستیان ماچکە لە پیاووژن
گچکە ماچ کردن چا نیە
زۆریش لەسەر قسە مەڕۆ
مڵچەتبێ سەرشۆری مەیە
بێدەنگ بیان هێنەوە بۆمن
دەزانم بۆ پارە دەمری

لەهیچکوێ زۆر دای‌مەبەستە
هەر تاوێکت پێ‌چو هەستە

هەتا لە چەنگی ڕزگار بوم
باوەڕکە لەخۆم بێزار بوم

هاتم لەدەرگێ بچمە دەر
"خێڵە"ی ژنم گەیشتە سەر

دەک هێرە لەت‌و پەت کرێی
یاخوا وەبەر جەنجەر درێی

خۆدەستی دایکمت ماچ نەکرد
خوایە هێرە بۆ هەر نەمرد؟!

گەڕامەوە زەلام، زەلام
بەدەستی خەسومدا نوسام

گوتم ئیشی‌ویش براوە
تەشقەڵەی تری نەماوە

کەچی هات خۆی گەیاندە لام
چەپۆکێکی هەر پێ‌دادام

پاڵە پەستۆی دام بۆ دەرێ
بەرێی کردم بۆ سەفەرێ!!

کە چومەدەر هەر ئەو کاتە
بەو ژیان‌و بەسەر هاتە

لەکوچە لاقم ڕاکێشا
هێند پێ‌کەنیم زگم دێشا

* * *

ئەو جار وەک بارگینی بێ‌ناڵ
وەرێ کەوتم بۆ هەوەڵ ماڵ

دەرکەم کوتا زۆر پێ‌نەچو
هەستێکلە حەوشە پەیدابو

کیژێکی گچکە هاتە دەر
خشتیلەو خاوەن سەرو بەر

هەر منی دی بە هەڵەدا
خۆی بە دەرکی‌ژورێ دادا

هاواری کرد... دایە، دایە
شێتێک ئەوە لەدەرگایە

وەک زاواکەی پورم دەچێ
گوتی: بچۆ، بلێ... بابێ

نیزیک‌ببۆوە ڕێگەی دور
"بسم الله"م کردو چومە ژور

ماچم کرد دەستی گەورە ژن
ئەویش پرسی لە حاڵی من

کیژی گەورەیان خوێندکار بو
زانین لە ئاکاری دیار بو

پاش تاوێک ئەویش هاتە ژور
بەڵام چێ وەک بوکی‌سور

هەستام گوتم: بوکە سورە
تۆ چەند ساڵ ئەبی؟ ببورە!

گوتی: بەقسەی دایکو بابم      هەر نۆزدە ساڵ دەبمو نابم
لەبن لێوم، گوتم؛ لەوێ      ماچ نابێ کوشینی دەوێ
گوتی: چیچی؟ نێرە زەلام      ئەو تەوسە چبو پێتدا دام؟
گوتم: دەستت دەڵێم ئەتۆ      ڕاوەستە بەسەرم مەڕۆ
من تەمەنم بۆتە سی ساڵ      ئەتۆش نۆزدەی بە حاڵەحاڵ
کەوابێ من گەورە ترم      جابۆیە دەبەرت مرم
ئەگەر دەستت ماچکەم نابێ      خەسوم گوتی ئەبێ وابێ
لەقاقای پێکەنینیان دا      شیرنیو شتیتریان هێنا
دەگەڵقسەی زەلام زەلام      تاتوانیم شیرنیم خوارد بەڵام
شۆکۆلاتە نەرمە کانم      سەبرێک داویشتە گیرفانم
ئیتر ئەبو بڕۆم لەوێ      تالێم وە درەنگی نەکەوێ
پێڵاوەکانم دەست دانێ      دەپێم نەکرد تا کۆلانێ
ئەگەر سەیری گیرفانم کرد      پڕبون چیتریان نەدەبرد
ئەوی لەکاغەز نوسرابو      سەری هەمویانم دابو
هەر مابو ماڵی "لالەخان"      ماڵی تۆزێک دوربو لێمان
دەستە خوشکی "خێلە"ی منبو      عەیب نەبێ! بێوەژن بو
مێردەکەی دوساڵ لەمەوبەر      ئەمری هەقی گەیشتە سەر
هەستا بارگەو بنەی تێکنا      ئەوژنەی لەپاش بەجێ ما
هەر چەند لە هیچی کەم نەبو      لەسەر وەشڕا بێخەم نەبو
لەکۆشکو لەپارەو تەلار      هەموی هەبون هەزار هەزار
سایە چەورو دەست بە خێربو      بەڵام ئەویش وەجاغ کوێربو
لەدوای ڕەحمەتی، لالە خان      کەوتە ناو سەروەت و سامان
سینگو بەرۆکی خۆم تەکاند      بۆ وێ دەلاقانم وەراند

* * *

دەستم بۆ جەرەس درێژ کرد     دەرکەم هەر لەرێسمەش نەبرد !
لالەخان دەرکی کردەوە     ئیتر هەرواقم بردەوە
ئای لەو ژنە خان و مانە     ئای لەو لەشە نەرم و جوانە
زاری وەک دەمی خونچە تەنگ     پەرچی رەشی وەک شەوەزەنگ
لەعەیبەت لاجانگی تەرزی     پەرەنگی گوارەی دەلەرزی
کراس لەسینگی دەخزی     مەمکی دادەگرت بە دزی
تاوێک عەبەسام ! لەدوایی     ڕۆژباشم کرد بە ئەسپایی
کە ئەو وەڵامی دامەوە     تۆزێک منیش بوژامەوە
بەروخۆشی گوتی : فەرمو     ئەحواڵت چۆنە لەگەڵ زو؟
گوتم : دەسەر سەرت گەڕێم     باشم ئەگەر باش بێتە ڕێم
گوتی : ڕاستە تۆ گۆڕاوی     شێت بوی لەسەر خۆ نەماوی؟
گوتم : ئەگەر ڕاستت دەوێ     مەرگی منت ڕەپێش کەوێ
ئەگەر شێتیش نەبام ئەتۆ     شێتت هەر دەکردم ئەورۆ
بەڕاست تۆ تەمەنت چەندە؟     زەردەی هاتێ دەت گوت قەندە
گوتی : وەک بێتە خەیاڵم     من ئێستە سی‌ویەک ساڵم
گوتم : جا بێ زەنا زەنا     بێنە دەستت ماچ کەم دەنا
هەر بەخەسوم بگاتەوە     ڕەش و شینم دەکاتەوە
ئەویش هێندم پێ پێ‌کەنی     بە پێ‌کەنین خۆی کرد خەنی
دەستی هێنا بەڵام چ دەست     لەتاوان لێوی خۆم دەگەست
ڕاست باشە، بەڵا لەدرۆدا     درۆ ناکەم لەڕوی تۆدا
منیش زۆر بە تامەزرۆیی     ماچم کرد نەم کرد نامۆیی
لێوم بە دەستیەوە نابو     هێشتە دەستم بەر نەدابو

گوتی : من قاوەم لێ ناوە تۆ شەربەت دەخۆی یان قاوە؟
گوتم : قاوەم پێ خۆش نیە شەربەتیش نازانم چیە!
بەمن بێ ئەوان هەڵ گرە شۆکۆلات لەوان خۆشترە
گوتی : شیرنی قەیدی نیە من مەبەستم "ئاوەکی" یە

***

هەر ئەوەندەی گوت و هەستا لەسەر قسەم رانەوەستا
چو بۆ شەربەت بەکوتەکوت منیش لەدڵی خۆمدا دەم گوت:
- شەربەت، شەربەت، شەربەت چیە دەی جا چبو ئاوەکی یە
ڕەنگە پێی وابێ بەفیزم نازانێ لەخۆ دەمیزم
تاتوند لەوێ بێشل چیە شۆکۆلات بۆچی وەکویە
واللە، لەسەر ئەو جوانیە فری بەدنیاوە نیە
من لەوەدابوم هاتەوە دەتگوت خەون دەمباتەوە
شوشەی لەپێشم هەڵچنی گلاسی دانان لەکنی
ئەوجار لەسەر کورسی نەرم خۆشی دانیشت بەرانبەرم
ئیتر من تەکبیرم چبێ؟ گوتم : چی ئەبێ با ببێ
هەر ئەو گلاسێ یەک ئەمن تاشوشەمان هێنان لەبن
بەتاڵم کرد نەیەک نە دو هەرهات و سەرم گەرم بو
هەوەڵ قومی پێم خۆش نەبو تۆزێک ڕەگی تاڵیی هەبو.
دوایی ئاگام لەخۆم برا خەسوو مەسوم لەبیر نەما
گەرم داییسام وەک ئاگر بەخۆم نەبو ترسام ئاخر
من دانیشتبوم لە خۆرا هۆدە لەدەورم دەسوڕا
پەنجەرەو دەرک و لاشیپان هیچی لەجێی خۆیان نەمان
مشکم لێ دەبو بەزەلام ئەوەش قەیدی نەبو بەلام

"لالە" کە هیچ عەیبی نەبو
سێ سەعاتیش پتر پێ چو
ئەوجار ئیتر پارا مەوە
تۆبۆلە خەسوت دەترسی؟
ئاخر من هۆشم چانیە
گوتی: کێ دەڵێ تۆ هێری؟
ڕۆژ خەریک بو ئاوا دەبو
هەرچەند دڵم هەرنەی دەویست
بە نابەدڵ هاتمە دەرێ
کە کیسەو قەنەم دەس دایە
باش بو ئەوەم لە بیر نەچو
"ئامان لای خەسوم باس مەکە"

دەگەڵ"خێلە" ی لێم تێک دەچو
من سەرەگێژەم هەر لێ بو
هێندێ دڵ خۆشی دامەوە
گوتم دەشزانیو دەش پرسی
ئیشم لەجێی خۆیدا نیە
هێری چی تۆ دەڵێی زیری
تیشک ڕوی لەحەوا دەبو
بەڵام قسەی ئەوم نەبیست
ڕۆژم ئاوا بردە سەرێ
هاتم بگەمە بێلایە
ئەوەندەشمان گوت دوبەدو
نەء "تۆش هیچ مەڵێ شێتەکە"

* * *

هاتمە وەماڵ بەقنە قن
خێزان و خەسوم لێ بران
هەر تاوێک لەوێ بون و زو
ئیتر بەناو ماڵێ وەر بون
خێزانم ڕوی خۆی دەڕنی...
تێلایەکی لە دەستا بو
خەسوم هەر کەفی دەپرژاند
جامن بڵێم چی دەگەڵ تۆ
منیش ئاگام لەهیچ نیە
ـ شێتەی ئاگا لەخۆ بڕاو

ئەوڕۆژەنا ڕۆژی دوای من
بچنە دیتنی "لالە خان"
هاتنەوە زۆریان پێ نەچو
هەردوکیان دەگیانم بەربون
زەندەقت دەچو لەکنی
لەسەر دەرفەت ڕاوەستابو
دەهاتو دەچوو دەی قیژاند
ئەتۆو ناوخزم و هاتو چۆ؟
هەرنازانم ئەوە چیە
ئەتۆو غەڵەتی وا گلاو؟

لێرە هەستای حۆڵی لاپان ئاوا چویە لای لالە خان؟
هەر ناوی لالەخانی برد لەئەژنۆ بەرەژێرم مرد
لەشم سڕبو دڵم لەرزی لەوێ کەوتمە سەر عەرزی
هاتم بڵێم سوچی وی بو من ئاوەکیم لەکوێ دی بو
نەیهێشت قسەکەم دەربڕم نەیهێشت هەردەم هەڵپچڕم
کربەکر دەنگت دەر نەیە. ئاگات لەدم و لەوسی هەیە؟
دەمگوت هەر گێلو ناوریای نەمدەزانی وا ماخولیای
دەگەڵ دەستەخوشکی ژنێت.. جاچت پێ بڵێم خدرەشێت؟
ئاخر ئەو کاتە ئەتۆم نارد چەند کەرەتم بەتۆ ئەسپارد
هەرجێیە چوی وەک عیسانان راست بچۆ ژوری میوانان
لای لالەخان بۆ وات نەکرد بەجارێ حەیای ئێمەت برد
لەوێ لەدەرکێ ڕاوەستای هەرچەندی حەولی لەگەڵ دای
هەر گوێت نەدایە، دوربەدور گوتت تەنیای نایەمە ژور
ئەسپاردەی منت لەبیر کرد ئەویشت ئاوا دڵگیر کرد
چیدیش ڕقم هەڵ مەستێنە هەستە ملی خۆت بشکێنە
ئەو پارەی بگرەو هەر ئێستە ئیتر لەهیچ کوێ مەوێستە
هێندێک شیرنی بکڕەو دیسان بچۆوە بۆلای لالەخان
بەڵام ئەو جار بچۆ ژورێ داوای لێ بکە لێت ببورێ
با گلەییم نەهێتە سەر بەڵکو لەدڵی بچێتە دەر

* * *

پارەم وەرگرت و چوم گەرام باژێرم هەمو کرد بەڵام
شتی تر ئەقڵم نەی بڕی منیش هەر ئاوەکیم کڕی!!
دەستم بەسمێڵاندا هێنا ئەو جاریش ملم لەڕێ نا

بۆ لای ماڵی لالەخان چوم بەڵام هەر بەدەستوری زوم
دەستەو داوێنی بوم هەتا هیچ گرێی لەدڵدا نەما!
ئاوا دڵی ویشم داوە کێشەی خەسوشم براوە
ئەوەندەش ماوەپێت بڵێم بەوشەرتە دەدڵی نەگری لێم
ئەگەر ئەقڵت هەیە کاکە... ئەتۆش هەر خۆت شێتکەی چاکە
شێتی نەک هەر زەرەر نیە لەشێتی باشتر هەر نیە
کێ ئەقڵی پارسەنگی دەوێ شت هەر وەگیر ئەو دەکەوێ
لەوەشدا کێ دەمکا لۆمە
ئەویش هەر ئاواڵی خۆمە

گوندی دێڵزە ١٩٧٣/٢/١٥

# "کوردوستان یان نەمان"

سڵاو پێش مەرگەی قارەمان
کوڕی نەبەزی نیشتمان
هەڵۆی خوێناوی سەربەردان
پڵینگی سەرشاخ و هەردان
کوڕی کوردی ئازاو دلێر
لەکوردوستان ڕامێنە تێر
ها، بڕوانە ئەو کیژۆڵە
چۆن دژ داماوە لەوچۆڵە
ئەو پیرە مێردی بێ تاوان
سەری ناوەتە سەر بەردان
دوژمن ئاغایە لەسەر تۆ
کێ ما نەگا بەمافی خۆ
ئەو خاکە خاکی کوردیە
سەبەب بۆهێرشی وی چیە
شەڕی مە شەڕی ژیانە
لەگەڵ وەتەن دا پەیمانە
دوژمن لەهێرشت تاساوە

چاکترین ڕۆڵەی کوردوستان
سڵاو پێش مەرگەی قارەمان
پەرکوری ڕەوەزو زەردان
پێش مەرگە جوان مێری مەردان
هەستە ڕاپەڕە وەکو شێر
وێران بو وڵاتی زەنوێر
برا گچکەکەی لە کۆڵە
چەندە هەژارو کڵۆڵە
ڕوت و هەژارو سەرگەردان
کێ ماڵی لێ کردوە وێران؟
ماڵی تۆ دەخوا بەفیرۆ
ئێمە تاکەی دەستەو ئەژنۆ؟
خۆخاوەنی دیکەی نیە
کوردوستانەو کورد خێویە
شەڕی باوەڕو ئیمانە
یان کوردوستان یان نەمانە
قەڵای هومێدی ڕوخاوە

لە دەستو بەردت راماوە     ڕۆژی ڕەشی لەبەر چاوە
لەکردەوەی ڕەنجە ڕۆیە     مانی بەفێڵ و دهۆیە
ئەوگەف و گەرمە درۆیە     لەرزی شەو نخونی تۆیە
باخوێنی من و تۆ برا     برژێ، سورکا دەشت و چیا
یاقوتی ناو سەوزە گیا     کوردوستان ڕەنگین‌تر ئەکا
تابرژێ خوێنی گەش و ئاڵ     لەسەر کەویان دەبێتە خاڵ
شین دەکا گوڵان سەری ساڵ     دەیکەنە تەواف کورو کاڵ
کاتێ کوردوستان بو ڕزگار     هاتەدەر لەدەستی زۆردار
کەس نەما بەدڵی خەم بار     بو بەشایی دێهاتو شار
ئەوسا بەرزکە ئاهەنگت     گۆرانیو گاڵتەو جەفەنگت

تاکیژو کور بێن بەدەنگت
ماچ بکەن لولەی تفەنگت

٦٥/١١/٢٨
دەنگی کوردوستانی عیراق

## "بەهاری کوردوستان"

چەند لە خونچەی بەر بەیانی جوانە زەردەوپێ کەنین
بۆ نەمامی بەژنی تۆ سەدهێندە چۆپی‌و هەڵپەڕین
دیمەنی شیرین‌و کوڵمی سورو بەژنی ڕێک‌و پێک
کەس تەماشای تۆی نەکرد وەک من کە نەی گوت ئافەرین
گوێت لەمن بگرە گوڵم تاکو بەکوردی پێت بڵێم
باسی کوردوستانی گەورە یان بەهەشتی سەرزەمین
لەشکری بای‌وەعدە هات‌و تەپڵی شادی گرتە دەس
نایە بەرپێ شاخ‌و هەردو کەویە بەفری هەڵدرین
ئاوە چۆڕەی کەوتەبن بەفری نواڵەو شیوو دۆڵ
تک‌تکەی دەرژێت‌و دەتروسکێ وەکو دورری سەمین
خاکەلێوە هات بەئالای دەوڵەتی نەورۆزەوە
دای‌کوتا پەرچەم لەسەر کوێستانێ وێنەی فاتحین
هەوری پۆل‌پۆل‌و گەواڵی دان بەسەریەکدا شەماڵ
جێگە تەنگ‌بو پێکی دادان پێچەوانە(۱) وراستەقین (۲)

---

*(۱) پێچەوانە : منفی .*
*(۲) ڕاستەقین : مثبت . کارەبالەویک کەوتنی ئەودوەپیک‌دی .*

کوێرو کەرر سەرسامن ئەودەروانێ ئەوگوێ هەڵدەخا
یان شریخەی هەورە یان بەرقی بریسکە وتێک خورین
خۆرنشین دەی دا بەسەرخۆیدا کە بۆ رۆژ هەڵ نەهات ؟
رۆژهەڵات دەیدا بەئەژنۆیدا لەتاوی خۆرنشین
دای رژاند باران بەخاکی کوردەواریدا چلۆن
هەروەکو فرمێسکەکانی من لەدوری تۆ گرین
چیمەنی کردۆتە پای ئەندازی بوکی سەرچلۆک
شەونمی کردۆتە گوارەی گوێی گوڵاڵەی سوروشین
بولبولی مەست هەڵوەدای یاقوتی ناو پیرۆزەیە
دەردەداری عیشقە کەنگێ سەردەنێتە سەرسەرین
چۆن بنوسم من کە چۆن شللێرو بەیبون لێک دران ؟
چۆنی تاریف کەم کە چۆن مەندۆک و بیزا تێک بەزین ؟
تولە رێواسی سەری هەڵدا دری پەردەی حەیا
ناسک و تورت و سپی وەک قۆڵی یاری نازەنین
بانەمەر هات و هەواری بۆ نشیمەن هەڵ بژارد
وەک لەسەر تەختی زومەررەد دابەزێ سوڵتانی چین
بۆ بەخێر هێنانی میوانی بەرێزی هەردو بۆ
چاوەرێ وێستاوە داوێن پر لەلالەی عەنبەرین
راپەری قومری سەری خونچەی پساندو خستیە پێی
وەک کە شێوەی کوردەکانە گاووگەردون سەربرین
بای شنە بۆ پێشوازی نەرم و هێدی کەوتە رێ
زیروەشانی کرد سکەی بێ نەخشی پەلکی یاسەمین

خێڵ ئەوە بارگەو بنەی هەڵبەستو گەورەی قافڵە
کاروانی بەردە سەرچاوەی ژیانو دابەزین
وەک قەڵای ئەو عێلەبێ سەرهۆزی سەنگین و گران
چادری هەڵداوە نۆئەستونەکو سێلا بەرین
لاوی شۆخو شەنگە سەرگەرمی جلیتو تەقڵەیە
بێریە باسکی هەڵدەکا دەروا بەقاقای پێکەنین
لایە کارەی مێگەلی پاراوو نرکەی شەکبەران
لایتری حیلەی کەحێلی تۆسنو ئەسپی بەزین
زەمزەمەی جوتێرە ، دەنکی لاوکە ، گۆرانیە
هەڵپەرینە ، داوەتە ، شکوایە ، ئێخە دادرین
شوانە بلۆێری وەناڵین خستوە بەیتی کۆن دەکا
کاکەمەم خۆی وای نەزانیوە هەواڵی خاتوزین
گەرچی شیرینە بەسەرهاتی سیامەندیش دەڵێ:
هەر لەپێناوی وەتەن سەربەرزئەکا هەڵئاوەسین
یانی ئەو خاکە گەلێک لاوی لەدەسداون بەڵام
حەیفە بۆغەیری شەهیدانی وەتەن گریانو شین
تابەچاوی خۆت ببینی هەرچی ئەورۆ لێ ی دوام
دەستیمن بگرە وەرە ئەی خۆشەویستم با بچین
ناتەوێ کۆشکی بڵیندو ، بورج و ، قەسرو ، سەرسەرا
ئەستەڕو(١) قەندیل(٢) وسامرەند(٣) وسپی(٤) ڕێزتکەدبین

(١) و (٢) و (٣) و (٤) ئەستەڕ ، قەندیل ، سامرەند ، سپیڕێز : لەکوێستان وکێوە بەرزەکانی کوردوستانی ئەمدیوە و ئەودیون .

زۆری پێناچێ کە ئەمن‌وتۆ بەکوێری دوژمنـــان
پێکەوە سەربەست‌و ئازاد هەر لەناو گەل‌دا دەژین
دەستی یەک دەگرین‌و وێکرا سەیری کوردوستان دەکەین
ئێمە کۆیلەی کوردەکانین وەک سیامەند نامرین
هێندی من دیتم لەڕابوردوی ژیانم سوێرو تـــاڵ
هەر بەرزگاری وڵاتم دەکرێ سارێــژی بـــرین
لـــەو بەهارە خۆشەدا لـــەو شادیە پیـــرۆزەدا
پێشکەشی بەژنی جوانی تـــۆ سڵاوی ئاگرین

شێخالێ

بانەمەڕی ١٣٣٥ هەتاوی

## "پایز"

پایزەو هەر بەکزەی باوە خەزەڵ هەڵدەوەرێ
مەل لەهێلانە لەسەرمان سەری ناکاتە دەرێ
شەختە بردویەتی دارو دەوەنو دەشتو زەوی
تۆزی سیخواری لەسەر نیشتوە هەورازو نەوی
زەردە لێی داوە لەدور را دەتروسکێنێ سەهۆل
شەونمو سەوزەگیا بونەتە فرمێسک و مژۆل
سەری شێواوە دەناو هەورو تەمێدا قەندیل (١)
گوڵی نێو باوەشی پەرپەر بو هەمو رۆیی بەدیل
سەر دەسورێنێ کلوی بەفرو بە زریانەوە دێ
دێو لەسەر ویشکەڵو پوشی گوڵی شەوبۆ دەکەوێ
بەندو سەرمایەکی وایە کەزەوی زێک دەکوشێ
دارو بەردو لق و پنچک هەمو لێک هەڵدەوەشێ
خۆی دەپارێزی بەلەونێکی ئەوی زیندە وەرە
جێی لەبەر ئاگرو ناوژورە ئەوی گیان لەبەرە

---

*(١) قەندیل: کوێستانێکی گەورەیە لەودیو کە لەوشاخە لەهێندی جێ چلەی هاوین ئاو ئەیبەستێ.*

غەیری پێش مەرگە کە هەر سەنگەرە جێی ڕۆژوشەوی
سەنگەری گرتوە بردویە زراوی نەتەوی
هێندی لێ شیرنە ڕاسان و شەڕو دەستو تفەنگ
کوری گۆرین دەیەوێ ڕێکی کوشێ سەنگەری تەنگ
دەڵێ ئەی دوژمنی ناپاک ئەوە گویەو مەیدان
ئەبێ هەر قشڵەیەکت لێ بکەمە گردی (١) سەیوان
منکوری کوردم و سەوداسەری کوردوستانم
نیە لام نرخی لەپێناوی وەتەندا گیانم
پڕ لە شانازیە تائێستە هەمو دەفتەری من
جەرگی دوژمن دەبڕێ ڕۆژی هەرا خەنجەری من
بەفرو سەرما چیە سەد هێندە کە بڕژێتە سەرم
نیە باکم کە ئەمن گوللە لەباوەش دەگرم
بەریمن ناگرێ دوژمن بەگەفو تۆپ و تەشەر
نابێ ڕزگاری لەچەنگم ئەجەلی گەیوەتە سەر
شەرتە کردومە دەگەڵ دایکی وەتەن یادەمرم
یان لەدوژمن هەقی فەوتاوی گەلم وەر دەگرم

٩٦٥/١٢/٣٠
رادیو دەنگی کوردوستانی عیراق

---

(١) گردی سەیوان : لەشاری هەڵمەتو قوربانی سولەیمانی یەو شوێنی ناشتنی گەلێک شەهیدە .

## "گوڵی خوێناوی"

کوڵمەت گەش و ڕوناکە دەڵێی تیشکی هەتاوە
جوان چاکی کراسێکە بە بەژنی تۆ بڕاوە
ئاسک سڵە نەک هێندی تۆ نەشمیل و ڕەزا سوک
گوڵ پێ دەکەنێ نەک وەکو تۆ وا بەحەیاوە
بسکت دەگەل ئەو ڕومەتە تێکەڵ بوە هەروەک
باغی گوڵە پەرژینی بەریحانە کراوە
سەد حیکمەتی گەر خوێندبێ نازانێ بەدەردم
هەرکەس بەگڕی ئاگری تۆ هەڵ نەچزاوە
جوانیت بەسە بەرمورەکەی ئەستۆت بپسێنە
من کوردم ئەزانم کە لە بەندی چ کراوە
تاگوارە لەگوێت دێتە لەرین دێتەوە بیرم
هەر لاوی کە لەو خاکە لە سێدارە دراوە
ئەو لالە کە دەیبینی وەکو ڕومەتت ئاڵە
هەر خونچە یەکی خوێنی شەهیدێکە ڕژاوە
هەرچی هەیە هەر باسی برۆ و بسک و خەت وخاڵ
هەر بەینی من و تۆیە کە کەس لێی نەدواوە

هەر مەرجی من و تۆیە وەتەن ماوە وەکو خۆی
هەودایە وەتا من هەم و تۆ هەی نەپساوە
سەیریکە لەدەست هەڵمەت و پارێزی کوڕی تۆ
دوژمن لە هەمو لاوە چلۆن مێشکی پڕاوە
دەنگی کوڕی تۆ دوژمنی هێناوەتە لەرزین
دەنگێکە ئەڵێی هەورە بەسەر شاخ و چیاوە
هاواری گەلی تۆ ئەوە دەرچو لە نهێنی
ئەو پەردە بەگوللەی کوڕە پێش مەرگە دڕاوە
سەر کەوتنی تۆی دیوە وەتەن دوژمنی ڕوڕەش
وا ڕۆژی ڕەشی هات و چرای ڕونی کوژاوە
ئەو جۆگەلە خوێنانە کە دەڕژێنە خڕودۆڵ
فرمێسکی کوڕی تۆ نیە وا لێڵ و قوراوە
خوێنی دڵی دوژمنتە وەتەن تاکو نەڵێن پێت
تۆڵەی "نەبی"(١) یو "عزت"(٢) و "میرە"(٣)ی نەکراوە
کاوانی (٤) گوێ بگرە لەدەنگی گەلی ئازات
سەر هەڵبڕە لەو خاکە ببینە چ کراوە

(١) نەبی سەر ئاسن بارزانی. (٢) عزت عبدالعزیز ئامێدی. (٣) میرۆ شێرۆکی بارزانی هەر سێکیان شەهید کراون عزت عبدالعزیز کە لەشۆڕشەکەی ساڵی ٤٥ بارزانیدا بەشداربو دوایی حکومەتی بەغدا لەداری‌دا، ئەوانی‌تر لەشۆڕشی ١١ ئیلول‌دا لەجەبهە شەهیدبون.

(٤) شەهید محمود کاوانی شەقڵاوەیی، لەجەبهەدا لەشۆڕشی ١١ئیلول‌دا شەهید بو.

تاوانی وەکو تۆی چوە پێش مەرگە کە ساتێ
نەسرەوتو هەتا خوێنی نەئەستاند نەحەساوە
تۆڵەی بەچی دەستێندرێ گەنجێکی وەکو تۆ
تا بن‌سەری ئاڵای گەلەکەی لێ نەچەقاوە
ئاڵا دەبێ جێی بن‌سەری تۆبێ کە نەڵێ کەس
ئەو پەرچەمە ڕەنگینە بەخوێن ئاو نەدراوە
شانازی ئەکا کورد کە لە مەیدانی خەباتا
بارزانی قەڵای ئاسنی کوردی بەپەناوە
بارزانی سەرۆکی مەزنی کۆمەڵی پارتی
کوردێک کە هەتا هەبوە بەسەربەرزی ژیاوە
إلهامی لەوی وەر دەگرێ پارتی خەباتکەر
وا بۆ وەتەنی گیانو ڕوحی هیچە بە لاوە
ژەنراڵێ کە هەرئەو تەمەنی پیرو جوانی
داناوە لەرێی ئەو گەلەداو کۆڵی نەداوە
ئەی خۆشبی وەتەن بۆکوری گرتوتە لە ئامێز
ئەی نەرزێ دەسی تۆڵە ستێنت کوری‌کاوە

٩٦٦/١/١٢
رادیو دەنگی کوردوستانی عیراق

## "من و ڕەقیب"

ئەوە کاتی پەلامارە ڕەقیب بابێتە مەیدانێ
ئەوی ناپاک و ناحەزبو بەکوردوستانەکەم کوانێ
هەتا نەی ئەنجنم وردی نەکەم ئەو شێتە نازانێ
کوری کوردی بەتین و تاقەتە وەک شێری نێولانێ
هەموی لەگیان و ماڵ رابردوە مەیلی نیشتمانانێ
ئەگەر سەد ئەفسەری نازداروسەرهەنگی بەناوبانگە
لەجێی سەرنێزە گەرهارەی فرۆکەونەعرەتەی تانگە
لەلام هیچەفیشەکدانی بەری پێم خشڵی لاجانگە
کەدیتی تاقەکوردێکی بەغیرەت دیارەلەروانگە
چەق و چۆدەی گرێودەگری بەتاووەک رێژنی بارانێ
لەژێر چەنگم ڕەها نابێ ئەگەر سەدگیانی هێنابێ
ئەگەر کفنی دڕی بێ سەدکەرەت ئەوجار دەبێ رابێ
لەجێی کفنی سپی گیانی لەنێو گێژاوی خوێن دابێ
لەشی بێروح وەکو زریان رنوی بەفرانی هەڵنابێ
دەبێ هەڵچندرێ ئەوجارلەشیووباسکی کوێستانی

وەها نەخشی دڵی خەمدیوە مەیلی خاکی ڕەنگینم
بەتۆفانی جەفا دانامرێ هاڵاوی ئاگرینم
لەسەر سەفحەی دڵم جێگیرە بۆتە دین و ئائینم
وەتەن ئەی نیشتمانی خۆشم ئەی مەڵبەندی نەسرینم
ئەتۆی ئارامی دڵ بۆیە بەبێ تۆ ناگرێ سامانێ

دەسەنگەردام و ناترسم دڵم پرتین و هێزدارە
دەبێ بڕوا بەبەرپێما ئەگەر سوێسن ئەگەر خارە
لەلام زۆر خۆشترە کوژرانی ناوسەنگەر لەسێدارە
بەنوکی نێزەکەم جەرگی ڕەقیب وەک قەل لەسەردارە
نەشێواوم کوڕێک نیم کەس بڵێ بۆگەل لەروح نانێ

١٩٦٦/١/٣١
لەدەنگی کوردوستانی عیراق خویندرایەوە

## "بۆبراکەم"

نامەیێکم پێ گەیی هەروەک گوڵاوی پەرچەمت
وەسوەسەم کرد ئەی خوا کەی دەم بنێمە ناودەمت
خۆزگە دەم زانی لەغوربەت کێیە بێ من هاودەمت
خۆ دەزانی گیانە بۆمن ناکرێ تەرکی غەمت

چاوەکانم بەسیە غوربەت بێرەوە
چۆن بژیم من تۆ لەوێ من لێرەوە

وێنەکەت دەرمانی سەرجەرگی برینداری منە
وەختی دڵ تەنگی بەبێ تۆ هەر ئەوە یاری منە
دیتنی ڕوناکی بۆ دو چاوی جۆباری منە
تاکولێت دورم عەزیزم شیوەنت کاری منە

چاوەکانم بەسیە غوربەت بێرەوە
چۆن بژیم من تۆ لەوێ من لێرەوە

نامە سەر دو چاوی تەڕ وێنەت لەدوی ماچ کردنی
سەردڵی شێوای خۆمە جێی لەپاش هەڵ گرتنی
شەمعی ڕوت بۆمن حەیاتی باقیە هەڵ کردنی
وا لەدڵ هاڵاوی بەخوا حەستەمە لابردنی

چــاوەکــانــم بــەسیــە غــوربــەت بیـّـرەوە
چــۆن بــژیــم مــن تــۆ لەویّ مــن لیـّـرەوە
سەیری کوردوستانی چۆلکەم یاتەمی کوێستانی دڵ
داخی دوری تۆ بچێژم یاغەمی هیزار (١) لەمـل
ئەی خەزانی غەم برۆ باشین بیّ باغم چڵ بە چڵ
ئەی فەلەک بابیّ بەهارستانی من سیّ چەپکە گوڵ
چــاوەکــانــم بــەسیــە غــوربــەت بیـّـرەوە
چــۆن بــژیــم مــن تــۆ لــەویّ مــن لیـّـرەوە
شێت و ماخولیای غەمی تۆم گیانە من دێوانەنیم
مەستی جامی مەیلی تۆم و ئەهلی نێو مەیخانەنیم
راستە سوتانم بەلام بیّ شەمعە خۆ پەروانە نیم
خاکی کوردوستان دەلیّ پێیت : رۆڵە من وێرانە نیم
چــاوەکــانــم بــەسیــە غــوربــەت بیـّـرەوە
چــۆن بــژیــم مــن تــۆ لــەویّ من لیـّــرەوە
گیانەکەم پێت وانەبیّ شانـۆی گەزاف و لافمە
مەیلی تۆ نیشەی دڵی خەمدیوو سینەی سافمە
هێرشی بەد خوییتە گەردون مو کە نیزەی جافمە
هەرشەوی هجرانی تۆیە موردی ئەوسافمـە

(١) هیزار: شتێکی دەست دروی وەک ئاڵقە و کۆچکەیە ژنان زۆرتر لەناوعەشیرەتی مەنگور لەملی ئەکەن بۆجوانی ، شتێک‌نیە لەگەڵ جلک‌بیّ .

چاوەکانم بەسیە غوربەت بێرەوە
چۆن بژیم من تۆ لەوێ من لێرەوە
دەردی دڵ بۆ کێ بەیان کەم دڵ کە ناڵاوێتەوە
ئەوگڕوی گرتویە چبکەم بێ‌تۆ ژیر نابێتەوە
بەفری بەفرانبارە بێ بای وەعدە قەت ناچێتەوە
ئەی خوا کەنگی عەزیزی ئەودڵەی من‌دێتەوە
چاوەکانم بەسیە غوربەت بێرەوە
چۆن بژیم من تۆ لەوێ من لێرەوە
باوەڕی نایە بەژینم دڵ بەدەس جزیاتەوە
خۆشە ڕوح دەربێ و بەجارێ بیخەمە ژێرپاتەوە
چونکە تەنیا هەردڵێکەو سەدبەڵا دەیباتەوە
چەرخی چەپ‌گەرد لێم بەقینە دەس‌لەمن ناکاتەوە
چاوەکانم بەسیە غوربەت بێرەوە
چۆن بژیم من تۆ لەوێ من لێرەوە
بولبول ئەڕ مەیلی سەفاتە بێرە لای من لحظەیەک
نابێ بۆ ناڵین و سوتان قەت وەکو من بەندەیەک
من بە بەندی نیشەدارو تۆش گوڵی سور دەستەیەک
تۆ ورینگەی شیعری ژێرو کەو لە کۆتریش لەنجەیەک
چاوەکانم بەسیە غوربەت بێرەوە
چۆن بژیم من تۆ لەوێ من لێرەوە
گوێت لە بەندی ئاخرم بگرە هەتا ڕوح ماوەپێم
گەرچی ئاڵۆزە بەڵام بم بورەچون "شێواو"ە لێم

تا بەڕوناکی چرای گۆنات دەبینم دەست و پێم
سەر لە سەر ئێخەی غەمی تۆپڕ بەکوردوستان دەڵێم

چـاوەکـانـم بـەسیـە غـوربـەت بیـرەوە
چـون بـژیـم مـن تـۆ لـەوێ مـن لیـرەوە

مهاباد سال ١٣٢٤ شمسی
٢٤/٤/١٢

## "فەوزیــە"

وەرە سەر دەرکــە وەکو مانگ لــەســـوێ
گوڵە کەم تاوێ لــەگــەڵ مــن بدوێ
وا لەڕێتا ســەری سەرگەر دانـــم
چــاو بەگــریانەوە لێــت دەڕوانـــم
گیان پەپولێکە لەدەورو بەرێتـــــۆ
واگڕی گرتوە لەسایـــەی ســەرێتـــۆ
دڵ بـــەئاواتـــەوە هەر دێتەوە لات
سەری داناوە لەڕێی هات و نەهات
وەرە سەیـری من و ڕەنگی زەردم
دەردی دوریت و هەناســەی سەردم
لێک دەکەن ڕۆژی من و پرچی ڕەشت
ڕەنگی فرمێسکی من و کوڵمی گەشـــت
زەردە زۆر کەوت‌و بەیان زۆر ئەنگوت
بەهەناســەی شنە گوڵ زۆر پشکوت
چاوی من هەرچی دەڕوی تۆ ڕامــا
لێوە کەت پێ نەکەنی‌و هەر وا مـــا

جوتێ لیمۆ کە لەسەر سینگی تۆن
ویست و دڵ خوازی منی تامەزرۆن
چ بڵێم چەندە سروشت ئارەقیڕشت
تاوە ها جوتێ ئەمی تۆی دارشت
تەمەنت گەیوەتە چاردە بەخەیاڵ
تازە زەرد هەڵ دەگەڕێ لیمۆی کاڵ
شەم لەناو پەردەوە کز دەنوێنێ
مەم لەبن ئێخەوە دڵ دەرفێنێ
جوتێ گۆی زێڕە بەچەند مانگ و ساڵ
خری هەڵداوە لەسەر زێوی قاڵ
سینگ و مەم تۆ بڵێ نەک زێڕو زێو
زێڕو زێو کەی بوە وا نیشە بزێو
بەدەم ئەو گۆیەوە دەنکێ یاقوت
بەسەری لالەوە ما ئاگری ڕوت
بەکزەی باوەکە لیمۆ دەوەرێ
مەمی تۆ هەر بەهەناسێک دەلەرێ
ئەی "مەهاباد" ئەتۆ جێی شانازی
پێی گەیاند باوەشی گەرمت قازی
کۆرپە کانی تۆ لەخان و سەردار
بەسەری بەرزەوە چونە سەردار
نیە ژین نرخی لە پێناوی تۆ
سەربچێ و بەرزەوەبێ ناوی تۆ

بەرزە جێت، تۆ سەری کوردوستانی
لانی کار مامزی، جێی شێرانی
دیمەنت چەشنێ دەبزوێنێ ئەوین
گاڵتە بۆ کیژو کوری تۆن مەم وزین
کور و کاڵی تۆ هەمو شۆخ و شەنگ
کیژی چاومەست و خرو نێوقەد تەنگ
گەڕەکێکت هەیە "مزگەوتی سور"
ڕوح لەسەر وێ دەگەڕێ دوراو دور
دەرک و بەر پەنجەرە ژور و هەیوان
حەوش و کۆڵان و قولینچک و سەربان
سەرشەقام و چەم و پرد و ڕێ باز
پڕ لە پشتین شلی نەشمیل و بەناز
گوڵی لێ شین بوە هەرچی دەتەوێ
غەڵفی هێناوە تەڕو شلک و نوێ
ڕۆژ درەنگانێ دەمەو ئێوارە
کیژوکاڵ دێنە سەر ئەو ڕوبارە
گۆزە ئاو هەڵ دەگرن بازنە لەقۆڵ
چەتری سەرکوڵمەیە بژرانگ و مژۆڵ
هەر گوڵینگی شەدە زۆر پڕ کارە
دەلەرێ و دەستری ژەنگی گوارە
نایەلێ خشڵی سەری هەڵگرێ ژەنگ
زەردە دەرکەوت و تروسکەی دێ پەرەنگ

دڵنیا نین لە زمانی بە درۆ
پێکەوە دێنە زمان چاوو برۆ
مانگەشەو هات و لەدەرک و بانان
کۆڕی دڵداری دەبەستن جوانان
بسکەکانیان بەپشوی با دەشەتێ
بۆنی خۆشی بە هەوادا دەڕەتێ
دڵ دەلەرزێنێ شەوانی شەوەزەنگ
دەنگی بەرموری کچی شۆخ و شەنگ
نیە جێیەک وەکو ئەو شارە لەلام
هەرچی تێیدایە لەلام جوانە بەلام
گوڵی وەک تۆی نیە پاک و روسور
لالەیو کەوتیە"ناوماڵی بلور"
"فەوزیە" تاقە گوڵی ناوشاری
پەیکەری جوانی ئەتۆو گیانداری
"نوێژگە" گەرچی لەپەنای ماڵەکەتە
حەج بەڵام دەورو بەری خاڵەکەتە
دەیشەماڵ تۆش وەرە خەم خۆری کۆن
زۆری وەک من بەتەمای هاتنیتۆن
بگە فریای دڵی پڕ لە خوێنم
دەگرێم رێم نیە بیشی دوێنم
بچۆ لای و بڵێ بەو دەم قەندە
ئاگرت کردەوە لەو مەڵ بەندە

هەرلەڕۆژی هەوەڵی دەربەدەریم
عیشقی تۆش هۆیە کە بۆ کوێرەوەریم
بەهەوای تۆوەیە دێ خورپە لەدڵ
دڵ هەرئی تۆیە هەتا دەیخەنە گڵ
ئەودەمەم خۆشە کەتۆش لەولاوە
کەزیەکانت بدەیە دەم باوە
با پەرێشانی بکا وەک دڵەکەم
هەڵمژم لێرەوە بۆنی گوڵەکەم
ئەی مەهاباد بەخوام ئەسپاردی
لێرە دڵ ساردبو منیش بۆم ناردی
هاتەوە باوەشی گەرم و گوڕی تۆ
هەڵ وەدای ئاوو گڵی تۆن کوڕی تۆ
هەرچی هەی تۆ گوڵی یان گوڵدانی
ئاوەدان بی وەتەنی کوردانی

ناوچەی باڵەک ١٩٦٧/٣/١٥ گوندی
سایە

## گاڵتەی جێژن

## "غەزەلی عیشقی ! !"

جۆگەلەی خوێنە لەناو دیدەیی گریانم دا
زۆر لەمێژە نیە هیچ "عانە" لەگیرفانم دا
هەردەڵێی جەرگی منە لەت‌لەت و سورو کون‌کون
ئەوتەماتەی هەڵی‌خست"مێرێ"(١) لەسەربانم دا
جگەرەی "رۆزمەن" ئەڵێن زۆرە بەڵام من نەم‌دی
غەیری ئەورۆژە لەناو باخەڵی میوانم دا
تۆ کە"جوجە"ی وەرە ناو کاولی مەعدەم چدەکەی
لەسەرانگوێلک‌و تەویلەو لەبن هەیوانم دا
سەرم ئەسلەع(٢) بوەهەرچەشنی "کدو" وئێستەنیە
دانەیەک ئەسپێ لەناو زولفی پەرێشانم دا
دوێنێ شەو هیچ نەبو بیخۆم و لەداخان نوستم
لە خەوا دیم"تەرەپیواز"ە لە نێو نانم دا
من‌کە دەم‌گوت نیە"شۆخێک" کەدڵم برفێنێ
"گۆشت بزن" هات‌و بەجارێک سەروسامانم دا

---

*(١) ناوی‌پیرەژنێکە لەسورەبان خذمەتی مقری دەکرد .*
*(٢) ئەسلەع : تاس .*

"دۆستەکەم" هات و گوتی ئێستە وڵات چۆڵە وەرە
کەدەچم "... موختارە" (١) "لەجێژوانم" دا
من لەلام وابو کە هەر "گیپە" یە ڕێی چارە کەچی
"ساوەر" یش چەشنی مەسیحایە لەدەرمانم دا
هێندەبێ "گۆشتم" و تامەزرۆ هەزار جارم کرد
فکری ئەوتۆزە چەقاڵتـە"ی کە لەنێورانم دا
چابو زوم زانی زگی هەڵ نەدریم "کاک...."
"دەنکە مێوژێکی" ڕەشی دیبولە "جزدانم" (٢) دا
"ڕانک و چوغە" شڕەکەی من کە بەسوری هاوین
لەرزوتام لێیە ئەبێ چۆن بێ لەزستانم دا؟
هەمو کەس دەردی هەیە کاکە بەڵام دەردی من
هەر گرانتر دەبێ وەک گوێلکێ لە پزدانم دا
دەنگی "ڕیخۆڵە" مە شمشاڵ لەزگم دا چدەکا؟
ئەوە "ساز" ێکە لەناو بەزمی فەقیرانـم دا
شیعرەکانم مەبە کاکە نەکو ڕۆژێک لەنەکاو
تۆش بدەی کەوڵی "خەز" و "تورمە" بەسەرشانم دا
"جێژنە" یەو بۆنی "کەباب" دێ لە هەمولا یە منیش
هەر "کولۆی خوێ" یە کە قرچەی دێ لەقەلیانم دا

(١) موختار : کوێخا سجل .
(٢) جزدان : کیفی باخەڵ .

"مام عەلی"(١) خۆش بێ ئەتۆ دەردو بەڵات هەرچی هەیە
باڵە "نانی ڕەق" و "چای شیرنی" بەیانانم دا

سورەبان جێژنی قوربانی ١٩٦٧

---

(١) عەلی عەجەم : نان و چێشتی لێ دەنا لەمەقەری سورەبان ئاشپەزبو .

## "مەلا"

بەهارەو سورەگوڵ دایان گەمارۆ     هەڵاڵەو نەستەرەن شین‌بون لەئاسۆ
وەکو دەشتی خوتەن خەمڵیوە سەحرا     لەبەرنازی شەقایق عەتری شەو بۆ
سەفای ئەوکاتە گەرچی ئاشکرایە     بەڵام تامی نیە بۆ من بەبێ تۆ
شەوی دیکە مەلایەک هاتە ئێرە     کەقوربان حەزدەکەم من بێمە لای تۆ
لەجێگای خۆم بەراتم سەدتەغارە     فەقێیشم هەربوە تاهەشت و تانۆ
هەمو ساڵێش لەگوندی داویانمێ     مەڕو مانگاو بزن بۆ ماست‌و بۆدۆ
بەئاغای گوت مەبەستی خۆی کەم‌وزۆر     ئەوێش گوێی دایە ئارام و لەسەرخۆ
لەپاشان پێی گوت‌ئاغا وا دیارە     کەڕۆین بۆ مەلایان بوتە ئاهۆ
کەنیتە ناتەواوی‌و ناگوزیری     ئەدی بۆچی دەڕۆی ئاخر مەلا بۆ
تەواوی ژینی تۆ هەر هاتو چۆیە     لەهەردوک لاوە بویە رایەڵ‌و پۆ
نەما جێیەک کەتۆ سەدجار نەچوبی     گەورک‌و مەنگورو پیران‌و ئاکۆ
هەقی نوێژێ لەڕوتی وا ئەسێنی     کە ئاگری پێوەنێی لێی نایە بۆسۆ
بەراتی چاک‌و قەدرو حورمەتی زۆر     برۆ شوکرێ‌بکە دانیشە بێ‌خۆ

مەلارۆیشت‌و بریا هەر نەبایەن
مەلای واو شاعیری وەک من چەقەسرۆ

شێخاڵی ١٣٤٠ هەتاوی

## "رزگاری"

وەرە بـا ئاگـری دڵ دابمـــریٚ.
تاکەی ئـاخر غەمی تۆ دام بگـریٚ؟
دڵ وەکو چـاوی خەواڵوت دامـاو
ژین وەکو کەزیەکـەت ئاڵۆزو بـڵاو
خـۆشەویستیت لـەدڵی دێـوانـــە
وەک خەزێنێکـە لەنـاو وێـرانـــە
دەس بدا دەست لەژیان هەڵدەگـرم
بۆبزێکـت کـە بە شـادی بمـرم
خوێنی دەرژیٚ کەسـیٚ لیٚـوت بمژیٚ
سەیـرە من تۆم نەدی خوێنم دەرژیٚ
ئافیدای تۆ نـەبـیٚ ژین یەک جـاری
تـۆ وەدەس چۆن ئەکەوی رزگـاری
بەکەمی مەگرە ژیانی بـە ئـەوین
دەئەوین دایـە هەمو تـامـی ژین
دیمەنت، هەردت، هەوارگەت، ئاوت
ئـەوچیـای سـەرلەتـەما شیـٚـواوت

پۆلە ئاسک مەلی ئاوارە لە چۆڵ
لاوی داخ بردە لەدەس دوژمنی زۆڵ
کەویە بەفرت لە نواڵەی کوێستان
داروبەردت هەموجێت کوردوستان
بانگ ئەکەن ئێمە ئەبێ سەربەست بین
لەش ئەنێژین ئەمرین دەربەست نین
نابەزین ئێمە ژیان وەردە گرین
ناسرەوین ئێمە ئەبێ سەربکەوین
خائنت با لەتۆ رو وەر گێرێ
خۆی بەدەس دوژمنی تۆ بسپێرێ
سەری شۆڕکا دژی تۆ تێکۆشێ
بۆبژیو خوێنی شەهید بفرۆشێ
سەری پێدەشتو دەمی کێوپارە
سەر لەبەردان کوتێ ئەو پەتیارە
بەرژەوەندی نەبێ ویژدانی نەوێ
نەسرەوێ رۆژو شەوێ دانەکەوێ
چارەنوسی تۆ بخاتە ژێرپێ
چارە نوسێک کەبەبێویش هەردێ
تۆبسوتێنێ بەمن پێ بکەنێ
قوڵکە بۆ ناشتنی خۆی هەڵبکەنێ
تۆبەڵام هەرهەتە دوارۆژی خۆش
زۆر کوری دیت هەیە بۆتۆ بەپەرۆش

کوری ئازا کەدەبەرتۆ دەمرێ
رێی هەموفێڵێ لەبیژو دەگرێ
لەمپەری تۆیە لەرۆژی تاڵی
هاودەمی تۆیە دەمی خۆش حاڵی
تێک دەدا کەندوکولۆو کۆسپی رێت
جاشی رورەش دەکەوێتە بەرپێت
گەلی تۆ کاتێ ئەتۆی دی داماو
چاوی سەرچاوەبو بۆ تۆ پرئاو
خێری بۆ لاوەبو شەرر بۆتۆبو
زیری بۆ دوژمن و زەرر بۆتۆ بو
راپەری دەستی درێژ کرد بۆ چەک
کێژ لەخۆی دارنی گوارەو کرمەک
هاتە ناو سەنگەری خۆ پاراستن
کەوتە بەر رێژنی ئاگرو ئاسن
بەرزی کرد پەرچەمی شۆرش زانی
تۆ بەخوێن دەستبکەوی هەرزانی
وەکو تیرێ لەکەوانت دەر چو
دەدڵی دوژمنە کانت راچو
سەرنەوی بو لەبەرت سەر بزوێن
تەرمی ناپاکی وی رامالی خوێن
رۆژێ دێ تەم لەسەرانت برەوێ
تیشکی ئازادی لەداوێن بکەوێ

کورەکان بێن و لەدەستا گوڵی ئاڵ
کیژەکان تێکەڵی کەن بسک و خاڵ
لەبن ئاڵای تۆ هەمو دەس بگرین
پاکی سارێژ بنەوە کۆنە برین
دەنگ بەرز کاتەوە ڕۆڵەی دڵسۆز
نیشتمان جێژنی کوڕانت پیرۆز

٩٦٨/٩/٩
زینوێ
لەئاهەنگی ١١ ایلولی ١٩٦٨
لەگەڵاڵە خوێندرایەوە.

## "کاڵە"

جوتێ کاڵەم هەبو ساڵێ لەچەرم
تیسکن و تای‌یەک و ئەستورو گەرم
سفت و بێ‌گنج‌وگرێ و لیێک و لەبار
شلک و بێ‌مەنفەزو بێ‌هەنگ (١) و نەرم
لوت‌قوت و پانیەبڵیندو ڕەنگ خۆش
کەوڵی شێرێ‌بو لەڕۆژی خەتەرم
لێو بەگژنیژو سەری پەنجەرە دار
کوڕی گووەندو شەریکی چەپەرم (٢)
سوکو بێ‌هەستو لە هاتو چۆدا
خۆم بەوە هەستم ئەکرد بەختە وەرم
لەچیاو ڕژدو هەڵەت چنگورکی
گیر ئەکرد بێ‌ئەوە بێڵێ بلەرم
بەن لەموی بزنی سپیو ڕەش تێکەڵ
وەکو ئاوریشم ئەهاتە نەزەرم

---

(١) هەنگ: هیندێک جار لەسەر پەشتی ڕەشە وڵاخ کونێک لەچەرمەکەدا ئەبێو کرمی لێ دێتەدە، بەوکونە ئەڵێن هەنگ.

(٢) چەپەر: سەنگەر.

بەو بەنە گرژو درێژە دەم بەست
هەر لەگوێزینگەوە! تاکو کەمەرم
کە لەپام توندم ئەکرد بۆ ڕێگە
درک وداڵ حەددی چبو بێتە بەرم
خەڵکی ئەوناوە لەبەر قۆچاغی.
هەرچی ئەی‌دیم وەی ئەزانی تەتەرم
دەرەوەی توکی وەکو مەخمەر بو
ناوەکەی لوس بو وەکو پێشە سەرم
تا ئەوانم هەبو بێزم نەدەهات
ناوی هیچ چەکمەو پوتینێ بەرم
وەختی ڕێگا وەکو پێڵاوێ لەپام
کاتی خەو دەبوە سەرینێ لەسەرم
ڕوی نەبو چەکمە لەپا بێ بۆ لام
گەربهاتایە بەتەقیەو بەشەرم
وەکو ئەوکاڵەیە نەم‌دی ئیتر
ئەو حەوت ساڵە کە من دەربەدەرم
شۆرشی کرد لەگەڵم خۆشم ئەویست
نەک بڵێی من بە سروشت وا لەچەرم
تاشە بەردێکی دڕو بەدفەڕو تیژ
ئەوی کون کردو لەتی‌کرد جگەرم
ئەو کە بەوجۆرە لەدەستم بۆوە
ڕۆژ بە ڕۆژ زۆر ئەبێ دەردو کەسەرم

هەر لەبەر حورمەتی ئەو من پاش ئـەو
لە هەمو کاڵە ئیتـر بـێ خـەبـەرم
شینـی ئەو کاڵە تەواو ناکـەم قەت
سەد وەک ئـەو نامە بمێنێ ئەسـەرم
هێشتە هـەر بیری ئەکەم یـادی بەخێر
لێـم جیابـۆوە ڕەفیقـی سـەفـەرم

١٩٧٠/٢/٢ ناوپردان

## "بــــزه"

نــازانم بۆت لەچی بدوێم      هەروا لە شتی جوان دەگەڕێم
لەمانگ، لەڕۆژ، لە ئەستێرە      لە شتی بەرچاو لەوێ، لێــرە
هەرچییە زەنوێرو بــەرزە      ئــەوی زۆر دڵگــرو تــەرزە
لە وەنەوشەی تــەری بەهار      لە خونچەی سەر چڵۆکی دار
لە تروسکەی ئاوی ئاوهەڵدێر      لەوێنەی مــانگــی ناو ئەستێر
لەئاونگی سەر پەلکــی شین      کەبەشنــەی بــا دێتەلــەرین
لەگوڵ لەپێ کەنینی گــوڵ      لە بولبول کە بۆی دێتــەکوڵ
لەهەنیەی سپی‌و قــەتــارە      لەلاجانگ‌و ورشــەی گــوارە
لەروی ناسکی کچ کــەبــڕێ      لەشەرمــان سورهــەڵ دەگەڕێ
لەو مەمکەی لەناو باخەڵ دا      هاتوە سەر لەکراسی هەڵدا
لــەنێوقەدی شــڵو نــەرم      نەرم‌و شلــی باوەش گــەرم
لەپەنجەی وەک تیشکی هەتاو      شوێنی‌بازن تــۆزێــک قــوپاو
لەڕەشانگی پینــە پینــە      کەکەو لێی دەکەونــە چینــە
لەقەرەنغڵــی ناو پــەرژیــن      لەیاقوت لەپیرۆزەی شیــن
هەریەک چەشنی جوانن لەلام      جوانی تــریش زۆرن بــەلام
ئەو خاڵەی لە کوڵمەی زێوت      خلیسکا بــۆ ســوچــی لێــوت
تــو ئــەو ئــاوێنە ڕاگــرە      بەمن لــە هەموان جوان‌ترە
ترســم هەیە تــێی ڕامێنــی      دەگەڵ بــزەت بــی بزوێنی
دەغیلت‌بــم بــا هەروابــێ      نــەوەک لەوێــش تلاسابــێ

گــوڵــم ئاوێنەکەت دانــێ
بــزەی‌تــۆ گــەمــەی نازانێ

٧٢/٣/١٠
دێلــزە

## "گەزوربە" (١)

ئەڵێم ئەوجار ناوت بێنم ئەوجار ئەڵێم بت ناسێنم
پەردە لەچرۆ چاوت لادەم بەڵکو ئاوا بەنت بادەم
کەوڵت ئاواژو کەمەوە سەری بەرەی هەڵدەمەوە
لەرابوردوت لە ئاکارت لەسوێندی پارو پێرارت
لەپەژارەو تێ گیراویت لەدامانو سەر سورماویت
لەفێڵت لە لایی لاییت لەشوێنە ونکەو دوڵاییت
لەوزەبرە کەپێی ئەتاسای مەرگی لەتەنیشت دائەنای
دیسان ئەوە بە نازەوە بەخۆتو دۆستی ! !(٢) تازەوە

---

*(١)* لەئاخر و ئۆخری ماوەی إنتقال‌داکە حکومەتی عیراق دوای بەیانی ١١ آدازی ١٩٧٠ دای‌نابو بۆ ئەوە کە حوکمی‌ذاتی بۆکوردوستان تەنفیذ بکات دەستی کرد بەمشاغەبە ولە هێندێک شوێن ئاڵۆزی و إستفزازی ئەکرد و لەگەڵ روسیاش پەیمانی عەسکەری بەستبو و دیاربو ئەیویست بەڵێنەکانی خۆی لەگەڵ شۆرش بخاتە پشت گوێ شیعری "گەزوربە" بەوبۆنەوە یەولە رادیۆی‌کوردوستانی عیراق خویندرایەوە: ١٩٧٤:

*(٢)* حکومەتی عیراق بۆماوەی پازدەساڵ پەیمانی نظامی لەگەڵ‌روسیا بەستوە.

بەرانبەرم خۆت ئەنوێنی       منی "هێدیش" ئەبزوێنی
خۆ من نەخەوتوم نەکاسم       من تۆشو ئەویش ئەناسم
ئەو دڵڕەشە دەس چڵکنە       چیرۆکی وی لەلای منە (١)
ساڵانیش کەوا خۆت ئەنواند       وەڕەزی خۆمان پێک دەشکاند !
بەنیوەڕۆو نیوە شەوێ       کوێ حەستەم بو دەچوینە وێ
سەرهەندرێن ، زۆزک ، سەفین       سەرگۆیژەو ، پیرس و ، مەتین
وابو تۆ برت نەدەکرد       لەگەڵ من دەرت نە دەبرد
لەبەرئەوە بە ئەسپایی       دەکشایەوە بۆ دەشتایی
گوڵمەزمان دەبردە دەشتێ       لەوێش دەستم دەت گەیشتێ
دەشێوایەو پەستا پەستا       هاوارت لەدو هەڵ دەستا
کوێرە ڕێیەکت دەدیەوە       بەوێدا خۆت دە دزیەوە
هەر لەچەنگم رزگار ئەبوی       دەربەست سەرماو گەرما نەبوی
درکی ڕێ بە پێتدا دەچو       بەڵام تۆ لەلات هیچ نەبو
ئەگەر لەناو ئاگری سور بای       پێتخۆش بو هەرلەمن دوربای
ڕێگەت ئەبڕی بەشپرێوی       شەوڕەویت ئەکرد وەک ڕێوی
خۆت داویشتەوە ناو تەلار       ناوکۆشکی هەزار بە هەزار
دەستت ئەکرد بەقسەی زلزل       تاوانت نە دەگرتە مل

---

(١) یەکیەتی‌سۆویات لەساڵی ١٣٢٤ هەتاوی‌دا لەئێران پشتی‌کۆماری مەهابادی‌گرت‌و دوایی بەڵێنی نەهێنا پیشتی پیدا و پشتی بەردان و لەنەتیجەدا زۆر لەنیشتمان پەروەران لەدارددران .

دەستو پێوەندو موچە خۆر    لەرەنگ و شکڵی جۆر بە جۆر
دەستیان دەکرد بە هاتو چۆ    دڵسۆزیان دەرئەبری بۆ تۆ
دەستیان بۆ لە ئەستۆ دەدای    دیسان پاڵیان پێوە دەنای :
خەمێکی زلە ئەو خەمە    خوێنیان بخۆی هێشتا کەمە
قوربان ئەو لەکوێ تۆ لەکوێ    ئەو چۆن لەگەڵ تۆی پێ دەکرێ
سێ چوار کەسن بونە چەتە    بچۆ بیان گرە فرسەتە
سەرلەنوێ شانۆت پێک دێنا    هەرچەکی هەت بو دەت هێنا
هەرچەند خۆت تاقی کردەوە    هەردۆرای و نەت بردەوە
زۆرت یەخەی خۆت دادری    چەک بیرو باوەری نەبری
لەپاش ئەو هەمو چەوتیە    من هیچم لەدڵدا نیە
من کورێکی مەردو رەندم    من بە بەڵێنم پابەندم
خۆم دە خوارەبا ناگرم    بۆ لێ‌قەومانیش ئاگرم
من ئەڵێم باشی (١) بپێوە!    بەشداری تر بەشی پێوە!
بەشی خۆت هەڵگرە بۆخۆت    هەتا تۆماوی بەسە بۆت
بەشی منیش با ئی من بێ    حەز ناکەم بەخوێن رشتن بێ
چ زستان بێ چ بەهار بێ    ئیشی هەردوک لامان دیاربێ
لە دروێنەو وەردو شێوێ    ئیتر سەرمان لێ ناشێوێ
یەکمان بۆ نیسکو نۆک چاندن    یەک بۆ وشتر لەوەراندن!!
ئێمە کە ئاوماڵ بین نابێ    شتی وامان لە ناودا بێ

(١) عیراق لەدو نەتەوەی کوردو عەرەب پێک‌هاتوە، کە کوردیش لەووڵاتەدا شوێنی دانیشتن و مافی ژیانی هەیە، کەس بۆی نیە گوێی لێ باخنێ.

من ... م پێ خۆش نیە !! بابۆتۆبێ قەیدی چیە ؟!!
لەسەر ئەو دەشتە نەرمەرا لەسەر ئەو هەمو ڕەڵمەرا
حەیفە تۆ بەو قاچە جوانە !! بێ‌یەناو ئەو بەردە ڵانە
من لێرە ئەیکەم بە هۆهۆ تۆش لەو خوارە وەرەو بچۆ
تۆ دانەوێڵەش نەچێنی خۆباشە مەشکێک ئاو دێنی !!
دروێنەو پاراوی توتن برینەوەی خوری و بەرگن
گێرەو شەن و بێڵ وەشاندن بەڵمی چەڵتوک هەڵتەکاندن
هەموی خەمی من بەمەرجێ تۆش فەرمانی خۆت بێنیە جێ
ئازابی لەراوی کولۆ !! نەهێڵی بێنە ناو پەمۆ.
ئێمە پێکەوە تەبابین چاولەدەستی‌هیچ‌کەس‌نابین(١)
لەوهەلە کەڵک وەرگرە یەکیەتی شتێکی ترە
وا ئیتر قەت وێک ناکەوین بۆشایی وشین برادەبین
لەکەری شەیتان وەرە خوار بادەس‌لەناودەس‌نێین ئەوجار
"لێ‌لێ"ی(٢) من و "یالەیلی"(٣) تۆ با بگرن جێگای "برا ڕۆ"
تۆش لەسەر پێودانی زوت هەرمشت و ماڵ دەکەی گەروت !
خۆت لەخواردنم هەڵدەکەی دیارە چاوەڕێی هەل دەکەی

(١) عیراق کە وڵاتێکی دەوڵەمەندە بەهۆی وەرخستنی نەفتەکەیەوە و نفوسی‌شی‌کەمەلەبەر شەری کوردوستان وای لێ‌هاتبو پارەی لەکوێت‌و وڵاتە عەرەبیەکانی خەلیج قەرز دەکرد کەمەسرەفی ئەو شەرە دابین‌بکا کەخۆیان بەسەر کوردیان‌دا سەپاندبو.

(٢): لێ‌لێ: گۆرانی فۆلکلوری کوردە.

(٣) یالەیل: گۆرانی فۆلکلوری عەرەبە.

هەرگوتم ئەورۆنا سبەی — تۆش‌پەی بەکارەسات ئەبەی
بەڵام ئەورۆژە هەر نەهات — ئاوەز (١) ئەڵێ‌ی‌زیزە لەلات
ئەوی گەل ویستی تۆنەت‌ویست — چەندی من گوتم تۆنەت‌بیست
شیری چەورت هێند خواردوە!! — خۆت زگەڕۆ فێر کردوە
ئێستاش چی ئەکەم تێرنابی — بەڵام تاکەی ئەبێ وابی؟
خۆ کاکە گەروت ئاش‌نیە — پاروی زل ئاخر باش نیە
بێتو دەقورگت بمێنێ — لەوانەیە بت خنکێنێ
من دڵسۆزی بو کردم بۆت — وەباڵی خۆت بە ئەستۆی خۆت
لەسەرئەو بیرورا کۆنە — کەمن باش ئەزانم چۆنە
ئەزانم رۆژێک لەرۆژان — برینت لێ‌دێتەوە ژان (٢)
ژانێک کەبێتو بت‌گرێ — بەهیچ کەس چارەت ناکرێ
جابۆیە گەر بەمن ئەکەی — واباشە خۆت فریو نەدەی
بەخۆت‌و قەمەی ژەنگاوی — خۆت مەخە سەختی‌و تەنگاوی
ئیتر پێ لە ئاگر مەنێ
بەو "گەزو ربە"ت نادەنێ

٧٢/٤/٤
دێلزە

(١) ئاوەز: ئەقڵ، تێ گەیشتن.

(٢) حکومەت خۆی ئاڵۆزی‌ی و ئاژاوەی ئەناوە ئەیویست شەردەست پێ‌بکاتەوە، ئەویش بەپشتیوانی یەکیەتی‌ی سۆویات کە پەیمانی عەسکەری‌ی لەگەڵ بەستبوو چەکی ئەدایە.

## "نەخۆشی ژنان"

کابرایەک بۆ دەس نوێژ دەچو     ئیشی زۆر بە پەلەی هەبو
پیرێژنێکی دی لەڕێدا     ئەویش ڕادەبرد بە وێدا
هەر چەند کە زۆریش تەنگاو بو     چونکە پیرێژن ناسیاو بو
ناچار هەروا کە ڕادەبرد     سەبرێک سڵاوێکی لێ کرد
ڕاش نەوەستا لەسەر وەڵام     پیرێژن یەخەی گرت بەڵام
هاتە پێش گوتی ببورە     براکەم نەقڵی من دورە
دوکتور بەمنی ئەسپاردوە     من تەرکی قسەم کردوە
پێی گوتوم کە کەس بدوێنم     بەرز ئەبێ پلەی خوێنم
کز دەبێ ڕوناکی چاوم     تێک دەچن دڵو هەناوم
دوای ئەوە سوار دەبێ پشوم     دەکەونە ژان سینگ و گەروم
ژان لەسەرم بڕواتە دەر     کۆخەڕەشەم دەگاتە سەر
جا مەبەستم دڵی تۆیە     من ئەو دەردەم لێیە بۆیە
ئەگەر کەسێک ڕوم تێ دەکا     وەک تۆ سڵاوم لێ دەکا

ناوێرم خۆلاسەی کەلام
بڵێم "وەعلیک السلام"

## "پێشمەرگەیەک"

نێوەڕاست مانگی هاوینە،
هەتاو تابڵێی بەتینە،،

خۆر بەڕودا لێی کەوتوە،،
زەوی لەباوەش گرتوە،،

خیزی ڕێ وەک پۆلوی ئاگر،،
داغ بوە، بگرە لەو چاتر،،

ڕۆژ لە عاسمان بەربۆتەوە،
لەوناوچە خۆی گرتۆتەوە،،

لەبەر گەرما، تۆزوغوبار،
ڕێی نیەچی تربێتە خوار،،

هەرچی گەڵی لەو ناوەیە
وەک دیزەی سەر نراوەیە،

جەبهەی ئێمەش وا ویشکەڕۆ
ئیتر لێی هەڵ دەستێ بوسۆ

بێجگە لەگەرمای سوتێنەر
ئاگریش دەڕژێتە سەرسەنگەر

نوزەی گوللەی تۆپو تفەنگ
هەردوبۆی هێناوە تە دەنگ

ئەو پێشمەرگەی لەو جەبهەیە
تەنیا دو ئاواتی هەیە

یەک "دوژمن لەناو بردنە"
ئەوی‌تر "لێو تەڕ کردنە"

مستێ ئاو خوێنی سەدکەسە،
تەنیا ئاوت هەبێ و بەسە

هەیەو نی‌یە یەک کانی‌یە
ئەویش لەڕوکار گەڵی‌یە

لەوبەر جاشو عەسکەر زۆرن
جاشک تۆرن عەسکەر بۆرن

تیرەی تریشیان لەگەڵە
بۆ پارە کەوتونە تەڵە

شوێنی کانیەکە پەسیوە
لە هەردوک لامان نەدیوە

مایەی ژینی هەردوک لایە
بۆ هەردوک لا وەک‌یەک وایە

ڕێگاشی دورو هەڵ دێـرە زۆر لاپاڵ و سەرە و ژێرە

* * *

ئەوڕۆژەش هەروا گەرما بـو ، ، تەقەش تاوێک بـو وەستابو
دو سەعات لەدوای نیوەشەو تۆپچیەکانیان هەستاند لەخەو
پێشمەرگە خزانە ناو سەنگەر جاشو عەسکەریـان دانە بەر
ئاگری تۆپی ماڵ وێرانکـەر نە جاشی دەهێشت نە عەسکەر
ئاگر دەخێوەت بـەر دەبـو کڵاوخود بۆ حەوا دەچـو
ڕۆژ سەری دەرکرد لەئاسـۆ تۆپی دوژمنیش کەوتە خـۆ
هەردوک حەزیای ئاگرپرژێن جەبهەیان کردە گۆمی خوێن
چەند تۆپ دەهات هێندەش دەچو دوکەڵیان تێکەڵ یەک دەبو
بەدوای ئەودا زۆر پـێ نـەچو فڕۆکەی دوژمن پەیدا بـو
ئیترهەر خوێن و تەرم بـو شـەر هێندەی تریش گەرم بو
بۆمباو تۆپ لەعەرزو حـەوا زەویان ئاگـر تێ بـەر دەدا
هەرلەش بو گۆشتی برژاو بـو مـەنجـەنیقێکـی تەواو بـو
پێشمەرگە بەرەوپێش دەچـون دەناو تۆزێدا ون دەبون
ڕەشاش وەککەوی سەربەردان دەیخوێند بۆجاشی سەرگەردان

* * *

نیوەڕۆ دەهات کل دەبـو ، ، تەقەش خەریک بو شـل دەبو
شەڕو ئەویش ڕۆژی ئـاوا گشت ئەگەڕان بـەدوی ئاوا
تۆپچی لێوی خۆی هەڵ دەملیست هەرچی دەتدی ئاوی دەویست
قوم قوموکە کەوتـن لـەوێ کـێ مەتارەی ویشکـی دەوێ
تینو بون یەکلەیەک پتـر مەتار لەوان دم ویشک تـر
هەمولایەک کـردیان بە قـاو کێ ئەتوانێ بچـێ بۆ ئاو

یەکی مێرد منداڵی چڵکن هاتەپێشێ گوتی : ئەمن
گورجێ ئێستریان دایەدەست تەنەکەو تێریان لێ هەڵبەست
غەدارە کەی کردە شانی ڕێگەی داگرت بۆ سەرکانی

* * *

شلبون هەنگاوی هاتوچۆ کات دەڕۆیی بە کاوەخۆ
شەکەتو سەخڵەت و تینو گەرماش سەرباری هەموان بو
چرتەی کاتژمێر هێدیبو ئەویش ڕۆژی وای نەدیبو
چاومان بڕیبوە ڕێی کانی هەر نەبڕاوە چاوە ڕوانی
هەرچەند سەرمان دێناو دەبرد دڵمان هەر بەوە خۆش دەکرد
فەرهاد دێتەوە ئاو دێنێ هەرکەس مەتارێک دەرفێنێ
لەپڕ ئێسترێک هات بەغار بەڵام بێ کورتانو بێ بار
فەرهادیشی لەگەڵ نیە ئەی خوایە ئەمە چیە؟
ئەبێ فەرهاد هەڵ دێرابێ ئەبێ جێیەکی شکابێ؟
بەسەر بۆسەدا کەوتوە؟ توشی جاش و عەسکەر بوە؟
هیوایەک هەبو ئەویش مرد پرتەو بۆڵەیان دەست پێکرد
کاکل لەتینوان چرژابو لەگەرمان ڕەش هەڵ گەرابو
لەبن بەردێ پاڵی داوە وتی : چی لێ نەقەوماوە
لەوێ خەوی لێ کەوتوە ئێستریش بەرهەڵدا بوە
کاری فەرهاد خۆ بواردنە ئەوکەی کوری ئیش کردنە
خەمێک تەواو نابێ ئەگەر خەمێکی تری دێتە سەر
کورم دەوێ پێ هەڵێنێ هەواڵێکی فەرهاد بێنێ
هەرئەو سەیری ئەوی دەکرد تێکەڵ دەبون سەرنجی ورد
کێ هێندەی هێز تێداماوە بەوبێ ئاوی و سورە تاوە

سەعات و نیوێک ڕێ ببڕێ
بەڵام ڕۆژی لێ قەومانی
دوکەس لەولا هەستانە پێ
گشت ئاوریان لێ دانەوە
ئێستریان هێنا سەر لەنوێ
تازە چەند هەنگاویان نابو
تێکرا گوتیان ئەمە چیە؟
یەک دەیگوت: فەرهاد خۆیەتی
ئەو دەیگوت: فەرهاد هەرنی یە
یەک دەیگوت: فەرهادی کوێیە
ئاخر چیمان کرد و کراند
دو چاروێ زەلامێک لەدو
کەم کەم دەهات ماندوبن چاو
ئیتر لەڕاست و چەپەوە
ڕەوین گنجی نێوان بڕۆ
یەک جێ بۆ لای فەرهاد خزین
قڵپەی ئاو ئەویش ڕۆژی وا
کێ لەپی دەستی تەڕ دەبو
بەڵام لەودەمەدا کوڕگەل
نە پەرژان فەرهاد بدوێنن
خۆی لەدوای ئاو دابەش کردن
کەدانیشت بڕێک حەساوە
هێندەی‌تریش ئارەق بسڕێ
پێش مەرگە وەستان نازانێ
سرتێکیان کردو کە وتنەڕێ
ئەی خۆزگە زو هاتبانەوە
ئەوانیش چون لەدوی چوێ
ڕەشاییەک لەدور پەیدا بو
ئەرێ ئەوە فەرهاد نیە
ئەوێ ڕێی هاتو چۆیە تی.
ڕێبوارێکە، داخوا چی یە
ئەو لەکوێ ئێستری پێیە؟
هیچمان لەوە هەڵ نەکراند
زەلامیش وەک فەرهاد دەچو
ڕەشایی هاتەپێش تەواو
هاواریان کرد، هەوە، هەوە
پشو هاتنەوە سەرە خۆ
هەمو هاتن لێی داوەرین
موسیقایەکە دڵ دەبا
دەسەروچاوی هەڵ دەسو
لەبەر تەنگاوی و پەلەپەل
سەرێ لەوکارە دەربێنن
وچانێکی هێنا کن من
نەقڵەکەی ئاوا گێڕاوە

* * *

کاتێ کە بۆ سەرکانی چوم     ڕۆییم لەبستو ئاوابوم
هێشتە مابوم بۆ سەرکانی     دەورو بەری خۆمم ڕوانی
لەولای گەڵی دو ئێستر سوار     بۆ سەرکانی دەهاتنە خوار
زانیم جاشن یان عەسکەرن     ئەوانیش هاتون ئاوبەرن
لێکدور بوین بەڵام دەمزانی     تێک هەڵدەنگوین لەسەرکانی
ڕوی تێکردم فکرو خەیاڵ     هەر ئەو جێی بەو دەکرد بەتاڵ
چ بکەم؟ بڵێی دەرفەت بێنم     چۆن دەستیان لێ بوەشێنم؟
چ بکەم نەهێڵم بێنە دەست؟     چۆن خۆم دامەزرێنم بێ‌هەست؟
نێچیر هاتۆتە بەردەستم     هەڵ دەفرێ ئەگەر ڕاوەستم
لەولاش چاوە ڕوانی منن     بەهیوای دەم تەڕ کردنن
واهات و لە بەختی چەوتم     لەوکارەدا سەر نەکەوتم
سەرشۆڕ ئەبم لەلای ئەوان     گاڵتەم پێ دەکەن بەهەموان
گەل، ناسکە ماوە کەمە،     ئەو دودڵیە چیە هەمە؟
نابێ ڕەقەی ڕێ داگرم     ڕێی ڕاست بگرمو ڕابرم
نەوەک ئەوانیش بخەفتێن     ئەوان بەر لەمن وەدەست بێن
ئێسترم دەنگدا بەرەو ماڵ     ئەوم ناردەوە بە چوار ناڵ
خۆشم داگەڕام بەرەوخوار     خزیمە ناو تەڕاش و دار
منبەر لەوان بە هاسانی     خۆم گەیاندە نیزیک کانی
لەناو تەڕاشێ دامەزرام     گەڵا تەنی‌بوی هەر چوارلام
پەلەم زۆرکرد کەچی زوبو     من ماندوییشم دەرچوبو
تازە لەولاوە جوتە سوار     گەوە و گەوە دەهاتنە خوار
لێم نیزیک بونەوە کەم کەم     کردم ئەوەی دەبو بیکەم
غەدارەکەم هێنا سەرپێ     ناش زانم چۆنم بۆ دەلوێ

هاتن هەتا گەیشتنە جێ
یەکیان جاش بو یەک عەسکەربو
هەر گەیشتنە سەر ، ئاوی سارد
ئێستریان لەدار گرێدا
بەرانبەر بەیەک دانیشتن
بەڵام ئیتر نۆبەی من بو
دەس ڕێژێکم کردنە سەرێ
عەسکەرپێوە بو بە تەنێ
جاشیش بۆ لای تفەنگ هەڵات
بەڵام ماوەی ویشم نەدا
بە پەلە پەل و چاوە چاو
بەوگەرمایە ماندوو مجرۆ
لەوێ مان کەلاکی بێگیان
بێوەی ئاگایان لە هیچ‌بێ
کڵاوخودێکی لە سەربو
تفەنگیان لەوێ هەڵ پەسارد
ڕەخت(١) وپشتێنیان فرێدا
بەربونە دەست و پێ شوشتن
ئەوجار جێی خۆدەرخستن بو
هەردوکیانم دانە بەرێ
هەرپێی نەکرا ڕاش بچەنێ
دەهات بگۆرێ کارەسات
خستم دەنیوەی ڕێگەدا
دەفرەکانم پرکرد لە ئاو
هەردوک ئێسترم‌دا پێش خۆ
ئەوەش تفەنگی هەردوکیان

* * *

بەڵام ئەگەر ڕاستت دەوێ ...
چونکە ئەو خۆ دا گرتنە
کە هاتم مانگێ لەمەوبەر
وتیان ئەبێ شارەزا بی
کاتێ حوکمی بەعثی زاڵم
هەواڵەکانی منیان کوشت
مزگەوت و زانکۆیان روخاند
دڵم باش لێی‌دەدا لەوێ
هەوەڵ تێکەوتنی منە
ڕێیان نەدام بچمە سەنگەر
جارێ تۆ بۆ ئەوە نابی
زانکۆیان دا بەر ناپاڵم
خوێنی"شوان"و"سەروەر"یان ڕشت
هێلانەیان لێمان شێواند

(١) ڕەخت : فیشەکدان .

"قەڵادز"ێ یان کرد خاپور
هەر ئەورۆژە بە بریندارى
شەرتم کرد لەگەڵ خواى خۆم
هەتاپشوم دێتە وەستان
هەر ناکەسێ دژى مەیە
پێش مەرگێکى گوێ لەمستبم
ئێستەش گوێم دەزرینگێتە وە
"سەروەر" دەگیان اللە دابو
دەگەڵى دەدوام جارو بار
چاوى هەڵێنا منى دى
شەقام پر بو لەخوێنی سور
منیش دەرکەوتم لە شارى
ئەورێیەى بگرم و بڕۆم
چەکێ هەڵگرم بۆکوردوستان
قەت بەزەییم پێ‌ىدا نەیە
تاهەم کوردوستان پەرست بم
ئەو وتەم وەبیر دێتەوە
دەستم دەناو دەستى نابو
فرمێسکیشم دەهاتە خوار
بەئارامى وتى"هێدى"
"نە بگرى نە خۆت ڕاژێنە"
"برابەو تۆڵەم بستێنە"

١٩٧٤/١٠/٢٥
دێڵزە ــ باڵەک

## "شینی هەڤاڵان"

ساڵو مانگ دێنو بەلەز تێ دەپەڕن
مەلی سەربەستنو تیژباڵو پەڕن
لە گەڕانی زەوی سەرگەردانن
نۆبە دەگرن لەسەری و نازانن
کێ لەژێر سێبەری وان سەردەکەوێ
کێیە ڕۆژی وەکو تاریکە شەوێ
کێن هەژاران ئەخەنە بەندو داو
چیە تاوانی گەلانی داماو
چڵکە هەورێ کە بەری ڕۆژ ئەگرێ
بەپشوی با لەبەری لا ئەدرێ
دوکەڵی گوندو چیای سوتاوە؟
یان هەنا سەی کوڕیباب کوژراوە؟
نەشەوان گوێ ئەدەنە شینی کەس
نەبەڕۆژ ڕۆژیش ئەڵێ تاوان بەس
سورو خولخواردنی چەرخی کۆنە
وەرە بڕوانە بزانە چۆنە

بــە هەمو ڕەنگــەوە خــۆی دەنوێنیّ
قەت لەسەر ڕەنگــی بەریّ نامێنــیّ
گــەڕی دیلانــە دەگــۆڕیّو دەگــەڕیّ
بوکــی ئاواتــە جوان هــەڵ دەپــەڕیّ
داخەکــەم ئەو خــەڕەکەش وەک جاراَن
دەگەڕیّ و هــەر لەدژی بــیّچــاران

* * * *

## "بەهار"

بەزەیی دێ بەھەتیو ھەوری بەھار
ڕێژنە بارانێ دەڕێژێتە خوار
شین دەکا بەرزو پەسارو داوێن
ھەڵ دەدەن تولە نەمامو لاوێن
قەترە ئاونگی گەڵای کشتو کاڵ
ڕون ئەبەن ھەروەکو چاوی قرژاڵ
مێگەلی تێرو تەسەل لێرو لەوێ
دێنو شاڵاو دەبەنە بەردە خوێ
گەورە ساڵ گۆشتنو پۆشتەو بەبەزن
تازەزاو گۆچ دەگرن ھەڵ دەبەزن
دەبنە دەستاڕو پنەی پانو بەرین
دوگی ئەستێورو سینگی پارین
زو لەدەشتێ لەوەر ئەکرێن بۆژە
ڕان ئیتر ڕوی لەقەدو بەر ڕۆژە
ڕێ لەرادان دەگرێ بەر لە شەوێن
شوانێ ماندو کەگرێیدا دەسبێن

قەرە هەر داسی کوروکاش دەسوێ
حەزدەکا شینکە لەسەربەرد بروێ
خۆش دەکا دوسەرە ڕێی هاتوچۆ (١)
ئاوی باران لەقەفی گەنم و جۆ
حەوشی کۆشک لەگوڵی دەس چێن پڕ
فڕی داوێنە گوڵی ڕژدو چڕ
کورتە باڵایە وەنەوشە مۆنە
چدەزانێ سەری بیزا چۆنە
لای‌لایی شەوە خرمەی باران
بەستەیە بۆ دڵی شەو بێداران
خوس دەبا گەر نەوی‌یە گەر بەرزە
دەزەلێن شێوو بەیار دووەرزە
کەچی لافاو وەکو دەستی زۆردار
دێ‌و لەبن هەڵ دەکەنێ کۆخی هەژار
تاوەخو دێتەوە چاو هەڵ دێنێ
خانوە قورماویەکەشی نامێنێ
ئاوی سێلاوێ دەنیشێ کەم کەم
وەرەبروانە دەبینی ئەو دەم
چی بەبارانی پەڵەی دێراوە
وەکو بزرانگی هەتیو تێرئاوە

---

*(١) باران کەئەبارێ جارێک لەسەررا بەگوڵ‌و قەفی گەنمدا دێتە خوارو ئەچێ لەزەویەوە جارێکیش لەزەویەوە دەغڵ ئەیخواتەوەو بەقەفەکاندا تێ‌ئەپەڕێتەوە بۆسەرێ ئەبێتە دوجار.*

## "هـاويــن"

موره هـەروا دەچەقــێ سێ (١) و چوار
تەختەنەرد هەر دەگەڕێ وەک پـەرگار
تاوی هاوین وەکو گەنجی بــێبــن
دێ کەدابـەش بــی لەدۆستو دوژمــن
تیشکی زێرین دەگــرێ بـەرزو نـەوی
سـەری زێرکفتــی گـەرم دادێ زەوی
هـەرکوێ حـەستـەمو دوره تـاوێ
پـەری ئـاواڵـەیـە پرشنـگ داوێ
سەردەکێشــێ لەکونی کۆشکو تـەلار
سرتــە دەدزێ لەدەمــی دو دڵــدار
هیچــی لــێ ون نیــە هەرچی جوانــە
شـانـە، تا بازنـە، تـا پاوانـە
وەک دڵــی گەنجی ئەویندار بە بەهار
گەرمە هاوینێ لـەشی ڕوتو هـەژار

---

(١)ساڵ چوارکەشو هەر کەشەی سێمانگە کە ئەکەونە سەر تەختەنەردی زەوی کە هەمیشە لەگەڕاندایە.

باغ و بێستانو ڕەزی کرچ و کاڵ
بە هەتاوو بەشنەی پیرەشەماڵ
ڕەنگی ساوایی دەگۆڕن دەگەنێ
سێو بەڕوی توکنی بێ پێ دەکەنێ
دار دەڕازێتەوە وەک بوکی سور
بەندەکێی میوە دەکاتە بەرمور
دایکی دڵسۆزو قژ ئاڵۆزی ترێ
کۆرپەڵەی شیرنی دەباوەش دەگرێ
باری لێ قورس ئەبێ داری ئاوس
چەتر ئەنگێوێ ئەبێتە تاوس
بەنەزەر هەرمێ سنوری دەشکێ
دەس لە شاتو بدەن ئابڕوی دەتکێ
بەمەمەی زەردەوە دەیکەن بەگرۆ
سینگی نارنج و بەڕۆکی لیمۆ
لاکەون پەلکی هەنارو هەنجیر
پەردە نامێنێ لەلای جوان و پیر
سیکەرۆ بێمنەتە لق بلەقێ
هوڵو نامەردە زراوی دەتەقێ
قەرەڵو ناکرێ دەرچن ڕەش و ڕوت
دەگەڵای شین دەخزێن تاق و جوت
شۆڕەبی گەر لە بەروبۆن بەریە
سێبەری وی وەکو باڵی پەریە

خشڵی زێری هەیە گێلاس دیارە
بۆی هەیە ناز بە پەرەنگی گوارە
هەر سپینداری ڕەبەن هیچی نیە
قوژبنێ دەگرێ لەجێی نۆبەچیە
سەری جوت بەندە لەئیش دا قاڵە
دوێنێ جوتێر بوە ئەورۆ پاڵە
دەغڵودانی دەگەنێ دێمو بەراو
وەردی هەرماوەتەوە نیوە تەواو
زو دەفریای نەکەوێ جۆدە پەرێ
دەبێ چی ئیشی ترە لێی بگەرێ
جێی ورینگە دەگرێ ئاخ و داخ
باوی دێ داس و هەسان و کەڵەشاخ
لایە دروێنەیە لایەک گێرە
سەرەتای کوێرەوەری وەرزێرە
سواڵە گوڵ پەرشە لەجێی خۆی کەبزوت
دانی لێ درژێ ئەویش وەک گوڵ ڕوت
گەنمەزەردە کە بەساڵی تەرەساڵ
ئاوەدانی بەوە عەمبارو چاڵ
بەرەکەت دەڕژێ لەدارو دیوار
نەکەویژ دێتە ژمارە نەتەعار
بەختی ناسازی فەقیرو داماو
نوستوەو ڕۆژێ دەبینی کە هەتاو
سەردەکێشی وەکوڕۆژان لە سوێ
کێ هەتیو بارە شکارتەی دەپوێ

* * * *

# "پاییز"

گێژە ڵوکەو شەرە بای پاییزە
ئاشکرا دیارە سروشت لێی زیزە
ڕەنگ بزرکاوە هەناسەی سەردە
کزە، ئالوزە، بەداخ و دەردە
جێ هەوار چۆلە لە چیغ و ڕەش ماڵ
دەگەڕێن ئێستە لەجێی وان قەلوداڵ
نەگورەی شوانە نە تورەی بلوێر
نەبزەی بێری نە هاوێر و بێر
نەهەوێزە (١) نە تەلانی بژوێن
نە خشەی سایەلەبەر دێ لەکولێن (٢)
نە کوچک (٣) مای نەچرا پاش سێرە
چاو بڕەکێنی دەگەڵ ئەستێرە

---

(١) هەوێز: حەوشی مەڕ.
(٢) کولێن: قولینچکی چادر کە تەرخانی ئەکەن بو ڕسق دانان.
(٣): بروانە لاپەرەی دوایی.

سەری سێپەک کە بەرزبو جاران
کەوتوە ئێستە لەبن دیواران
نەزەمەندە نەچیای سەوزو شین
نە چلاوچڵ دەفڕێ مێش هەنگوین
نەکچان دانە مەڕی ئێواران
داوەتێکی دەگرن وەک جاران
کپ و بێهەستە هەوار خامۆشە
جێ هەوار چۆل و چیاناخۆشە
جاروبار خشپەیە دێ و نوزەی با
قانگەلاش دێنێ لەگەڵ خۆی دەیبا
باوی ئاونگ چو لەجێی ئەو سیخوار
نیشتوە تۆزی لەشێوەردو بەیار
پیرەزریان بەکزەی ساردوسڕی
وەک دەلێن: بەرگی فەقیرانی دڕی
لەتەنیشت هەرکەسەوە ڕادەبڕی
وەکو دوپشکێ چزوی دادەگری

* * * *

(رون کردنەوەی لاپەرەی پێشو)
(٣) کوچک: سێ بەردە لە جیاتی کوانو لەژێر مەنجەڵی شیردا لە هەوار دای ئەنێن بۆ شیرکوڵاندن و پەنیر وتیژاوکوڵاندنەوە ئاگری تێدا ئەکەنەوە.

پاییزی عومریش ئەوە نیزیکە
ماوەی ئەو ژینە نیە چیدیکە
سەر ئەوە بەفری سپی کەوتە سەریْ
ڕۆژ، گەڵای عومریش ئەوە هەڵدەوەریْ
باخچە بێڕەنگ و کزو ژاکاون
شەختەیان گەیوەتەسەر لێیداون
سورەگوڵ سیسە گەڵای پەرپەر بون
خۆی کەساسدیوە مژۆڵی تەڕ (١) بون
سەردەمێ هەرچیبو نازی ئەوبو
ئەوی دڵدارە نیازی بەو بو
گیان لەلەش دەردەچو دەورەی دەتەنی
تا بەدەم سروەوە ئەو پێدەکەنی
ئێستە تەنیایە گەڵاو پۆپی وەری
بەسەری نارۆم ئەگەر خوێن بگری
چونکە گوڵ بۆوە نیە گریانی
تەمەنی کەم بو ئەویش دەیزانی
ژین هەتا سەرنیە مەرگی دەگەڵە
دڵپڕی وی لەچەپۆکی (٢) خەزەڵە

* * * *

(١) گوڵ کە گەڵا سورەکەی وەری گەڵای شینی سەر نێرتکەکەی وەک مژۆڵ ئەچێ کە خوسی پایز وەک فرمێسک لەسەری ئەتوێتەوەو دێتەخوار.

(٢) : بڕوانە لاپەرەی دوایی

بولبولی دەربەدەر ئەجریوێنێ
هێزی تێدا نیە بچریکێنێ
لەرزی لێیەو بەوتەی بێ سەروبن
"شینی ئاوالی" دەگێڕێ وەک من
ئەویش ئاوارە بەداخ و کەسەرە
سەدپەژارەو غەم و دەردی لەبەرە
لایەکی داخی گوڵی با بردو
لایە هێلانە بەرەڵڵا کردو
لایەکی تیری توانج و تانە
لایەکی سەختەتی ئاوو دانە
گەردو لوریش لەسەر ئەو حاڵەشرە
بۆی نەهێشتۆتەوە ڕێی باڵەفرە (١)
هیندژو بێکەس و سەر گەردانە
وا کەسیرەبوە بەستە زمانە

---

(١) لەوکاتەدا کوردی دەرەوەی عیراق چ نیشتە جێ چ ئاوارە دەرفەتی جوڵانەوەو چالاکی ی نەتەوایەتیان زۆر کەمبو بەدو دەلیل کەیەکیان دۆستایەتی شۆرش لەگەڵ هێندێ لایەن و ئەوی‌تر پاراستنی بەرژەوەندی شۆرش بوکەسەرکەوتنی ئەوشۆرشە هومێدی هەمو نیشتمان پەروەرێک بو لە هەمو ناوچەکان.
(رون کردنەوەی لاپەرەی پێشو)

(٢) پنجی گوڵ نەویە کەلەگەڵا ڕێزانی پایزدا گەڵای داری تری بەسەردا ئەکەوێ ئەڵێی چەپۆکی لێ ئەنێ.

هەرکەسێ بۆی بچێ باڵی دەگرێ
بە هەموجۆر (۱) !! لەقەفەزتوند ئەکرێ
دەیەوێ بەستە بڵێ‌و هیند پەستە
دەبزرکێنێ لەباتی بەستە

* * * *

خەفەتی زۆرە لەزستان ئەگەڕێم
بۆ وڵات دەچمەوە، کوێستان دەگەڕێم
هەر لەباکورەوە تاکو باشور
چۆمەڵ و دەشت و چیای سەخت و دور
بەدڵی گەرم و بەهەنگاوی ورد
بازێ داوێم لەسنوری دەس کرد

* * * *

(۱) لەودیوەو دیو گرتن‌و زیندانی کردنی کوردی لێ‌قەوماو زۆر هاسان‌بو.

# سۆما

پێش هەمو جێیە لە سۆما تاوێ
گرر دەخۆم ڕێی دەخشێنم چاوێ
داخۆ ئەوناوە چلۆنە ئێستە؟
چۆن لەژێر پێی ستەماپێ پەستە؟
چون دەژین ئێستە بەترس و لەرزن؟
یاخۆ هەر بێمنەت و سەربەرزن؟
دەزرینگێتەوە ئێستەش گوێیان؟
خوێن دەچۆڕێ لە دڵی توێ توێ یان؟
هەر ڕەشاش دەبنە کەوی بنبەردان؟
قرمەیان دێ هەرەتی "جۆزەردان" (١)؟
ئێستە هەستانی سبەینانە لە"خەو" (٢)
بە تەقەی برنوە یان قاسپەی کەو؟

---

*(١) و (٢): مانگی جۆزەردان لەبەرە بەیانێکدا جاش و ژاندرمە دایان بەسەر شەهید باپیرو هەڤاڵەکانیدا کە هێشتە لەخەو دابون و ئەوانیش پیاوانە لێیان وەدەست هاتن و لەتەقەی یەکەمدا شەهید باپیر زۆری لێ کوشتن.*

هێشتە هەرخوێن دەمژن دەبنە گـەنە؟
کۆنە ژاندارمی دزی دەس بـەخەنـە؟
چەتە بۆ کوشتنی‌وان چـی پێ‌یە؟
گۆڕی "باپیر" ی شەهید لەکوێ یە؟
گوندی "ساکا" (١) سەری هەروا بەتەمە؟
"حەسی" (٢) دڵیان بەپەژارەو بەخەمە؟
"گڵەخڕ" (٣) چی‌دی کـرایـە شەرگە؟
چۆن بو دەس ڕێژی نحۆی (٤) پێش‌مەرگە؟
چەندی لێ‌گرتنە بەرڕێزی ڕەشـاش؟
چۆن بو فیشەک نەدەڕۆیی بـەبـەلاش
چەند بەجێ مابو کـەلاکـی بۆگەن؟
بۆچ نەبـو ماوە دەگڵیان ڕۆ کـەن؟
چۆن لە پێشوازی مەرگ بو بە دەلیل؟
قـۆچـی قوربانی "مـەلا اسماعیل" (٥)
ئەودەمەی‌"ناجی" (٦) و "فەیروز" (٧) کوژران
کاتێ "باپیر و "ڕەزا" (٨) دابێژران

(١) و (٢) و (٣): ساکا ناوی گوندی شەهید باپیرە و خۆی لەبنەماڵی حەسی‌بوو ئەوشوێنەی شەڕەکەی لێ‌کرا گڵەخڕی ناوە.

(٤): شەهید باپیر کەناوی خۆی نحۆبو کاتێک لەخەو ڕاپەڕی دەورەی گیرابو کلاشینکۆفی لەژاندارم و جاش ڕشاند و هەتا شەهیدا کرا بیست‌کەسی لێ کوشتن.

(٥): مەلا اسماعیل هەڤاڵێکی‌تری نحۆبو.

٦ ـ ٧ ـ ٨: بروانە لاپەڕەی دوایی.

چۆن بو ئەو ناوە نە هەستا نەبزوت
چبو سۆما نـەگری گرت‌و نەسـوت
کەی ئەدی هەڵ دەکرێن باسک و مەچەک
چەک لەدوژمن کەنەوە دەس بەکوتەک
چەتە سۆمایی (١) لەچاوان بـردن
چون‌بو سۆمایی (٢) لەبیریان کـردن
هیچ دەزانن کە کوری تۆڵـەستێـن
هـەر بەرێبازی شـەهیدانـا دێـن
خەنجەری رق بەدەسی تۆڵە دەسـون
چەرمی ژاندارمی دزی پێ بگـرون
کـارەسات مـاوە بەڵام هێشتـەزوە
خوێنی وان گۆڵمەزی دی زۆر لـەدوە

(١) سۆمایی : روناکی‌چاو.
(٢) سۆمایی : خەڵکی سۆما ، دانیشتوانی‌سۆما. "سۆمـا ناوچەیەکە لەکوردەواری سنوری‌تورکیا".
(رون کردنەوەی لاپەرەی پێشو)
(٦) ناجی
(٧) فەیروز
(٨) رەزا : هەڤاڵەکانی شەهید باپیربون‌کەهەمویان پێکەوە لەناوچەی سۆما شەهیدکران.
رەزا مامی باپیربو و فەیزوریش برای‌و ناجی خوشکەزای بو.

## مەهاباد

لەمەهابادەوە ڕێ تێ دەپەڕێ
هەلە باگیان بە سەریدا بگەڕێ
گەشکە بگرێ بەشنەی نەرم و نیان
هەڵمژێ جارێ تریش بۆنی ژیان
جێی پشودانە درەنگ وەختە شەوە
ئێرە میوانگرو دەستەو جڵەوە
دڵەجا دەرفەتە بیکە گروگاڵ
وەرە دامەزرێ کەجێی تۆیە خەیاڵ
لێرەیە دڵ بەهەموشت دەهەژێ
هەموجێی بیرەوەری لێ دەڕژێ
دور بە دور هێندێ چرای دڵ سوتاو
جاروبار لێم دەتروکێنن چاو
هەست ئەوەکەم بوە لەو چۆل و چرە
کێوی دابین بوە باڵندە کرە
ئەگەر ئاڵۆز بێ خەیاڵی خاوم
سوچی خورپەی دڵەو ئاوی چاوم
لەدەسم دەرچوە یەک جێ‌هەستم
هەموجێی گرتوە پێی ناوەستم

# چوارچرا

ڕێگە دەڕوا وەکو هـەودای خەیـاڵ
دەم گەیێ نێتەوە جـێ‌کـۆڕی بەتاڵ
"چوارچرا" لـەوبـەرەوە دەم‌کێشـێ
سـەری سەودام هـەیـە دەچمە پێشـێ
باش کـە دەڕوانمـە تـاریکـایـی
داوەڵی (١) قوچـی دەکـا تارمایـی
چقڵە خـۆی‌و لەگوڵی دەوری سڵـە
چقڵی لـێ لاچێ ئەوی دیکە گوڵـە
شێرە (٢) بەردینە لەجێی پـەرژینـە
پشتی لـەو داوەڵـە نـاشیـرینـە
نـایەوێ چـاوی بـەچارەی بکـەوێ
کـەچی ناچارە لـەبـەرپێی دەخەوێ

---

*(١) داوەڵ: پەیکەر، مجسمەی شای گۆڕبەگۆڕ کەلەمەیدانی چوارچرا داندرابو.*

*(٢) لەدەوری داوەڵەکە چەندپەیکەری شێردروست‌کرابوو زنجیر کرابون وبن‌داوەڵە کەچێندرابو بەگوڵ.*

داخم ئەو خاکە لەدەس پیس و چەپەڵ
ڕۆژێ سێدارەیە (١) ڕۆژێک داوەڵ
هەرچی لەوناوەیە هەریەک بەجوێ
لەشتی کۆن و نوێ بۆم دەدوێ
بەکون و قوژبنە (٢) ڕێی باریکە
وەک دڵی داوەڵەکەی تاریکە
هەستی دوچەشنە لەدڵ دێن و دەچن
خۆشەویستی و ڕقی دۆست و دوژمن
چەق و چۆ دەم گرێ دێمە لەرزە
گیانی "قازی" دەفرێ لەو بەرزە
لێرە هەڵ نایە ئیتر چاوی تەڕم
کورنشێکی دەکەم و تێ دەپەڕم

* * * *

(١) قازی محمد و صدرالاسلامی برای و حەمەحسین خان لەجێی ئەو مجسمە بەدەستی جەلادەکانی شالەدار دران.
(٢) ستادی لشکرو فەرمانداری لەسەر ئەوچوار چرایەن.

# بـازار

دەگەڕێ ژان لـەدڵـی بەبرین دا
هێشتە شار هەر دەخەوی شیـرین‌دا
چاوەڕێم زەردە لەگەل بێتە دەرێ
شەوی تاریکی دەگەڵ بێتـە سـەرێ
شەو کە باڵی‌ڕەشـی لادا لـەسـەری
سەیری شاری دەکـەم و دەوروبـەری
دورونیـزیکـی دەگـرمـە بـەرچـاو
هـەمـو جێگای بەسەرنجێکی تـەواو
چی‌بە سەر هاتوە شـار چۆن ماوە؟
هـەروەکـو پێشـوە یـان گـۆڕاوە؟
ئەهلی بازێرەکـە چۆنـن دژنیـن؟
وەکوجاران بـەگـەمە و گاڵتە دەژین؟
ئـەوبەرەوبـەر لـەیەک ئـاگـادارن؟
هەمو هـەروا لـەستـەم بێـزارن؟
کـەلـەوێ ڕادەبـــرێ داگیـرکـەر
دەی دەنـە بەر بـەگەپ و تیزو تەشەر؟

با ئەگەردێنێ هەواڵی "ئەولا"
دەتەقێن لینگە تەرازو لە دو لا؟
دەگەرێ دەنگ و هەمو شار دەگرێ؟
دورە دەست کێیە خەبەردار دەکرێ؟
لێک وەکو دێن و لەکۆشکی ڕەنگین
دەیکەنە سرتە بەپەردەو پەرژین؟
رۆن فرۆش چۆن "کەرە"(١) کەی دەفرۆشی!؟
جاشی زۆر گەورە دەدا بە قرۆشێ؟
کەس هەیە بۆم بڵێ نەرمە نەرمە؟
"مامڵێ" بەزمی شەوانەی گەرمە؟
لاوەکانی وەکو پیری زیرن؟
بەتەمەن گەنج و بەزانست پیرن؟
هەرمەبەست کۆمەڵە چەوسانەوەیان؟
بەرژەوەندی گەلە لێکدانەوەیان؟
کۆرێ دەگرن بەشەوی دورودرێژ؟
لەهەمو بارێ دەکەونە وتوویێژ؟

---

(١) کابرایەکی ڕۆن فرۆش رۆژێک لەمەهاباد هێندێکی ڕۆنی کەرە دەقاپێک‌دا بەدەستەوە گرتبوو لەشەقام وەدوای رەئیس جاشێک کەوتبوو هاواری دەکرد. ئای ئەو کەرەی دەفرۆشم، کێ ئەو کەرەم لێ دەکرێ؟ ..... رەئیس جاشەکە ئاوری ئەداوە ئەی‌زانی مەبەستی رۆن فرۆشەکە چی‌یە... نەش ئەکرا هیچ بڵێ.

دەی کەنە پیلە لـەسەر راست و خـوار؟
دەگەنە بنـج و بنـاوانـی کـار؟
هەردەڵێن داخـۆ بەگەل لەوتەمـەنـە
هەموشت لایەک و لای دی وەتـە نـە؟
هەست ئەکەن چۆن لەسەر ئەورێ دورە
گەلێ پێیانـەوە پشـت ئـەستـورە؟
"کاکەمین" (١) ئەوسەروبەندەی چۆنە؟
دڵـی سوتـاوی دەکـا سـەرکـۆنە؟
داخۆ سارێژ نەبـوە کۆنـەبـرین؟
گەرمە شینـێ گەلێ فرمێسکی وەریـن؟
بـەهەمو هـەستەوە شینـی گێـرا؟
یان لەبەر دوژمنـەکەی نـەی وێـرا؟
خۆشەویستـی بەفیـدای کورد کـردن
باجی خوێن بـو لـەسـەری لابردن؟
بـەرهەمی عومـری درێژی، نـانـا.
گەوهەری ژینـی لـەرێی گـەل دانا
بۆی دەسوتێ دڵ و دانـامـرکـێ
هەست ئەلێی ئـاگرە بـۆم نادرکێ
بۆیە چـیـپـێ نـەکرا پێنـوسـم
هەر مەگەر دەست و دەمـی رامـوسـم

(١) محمد امین معینی: باوکی شەهید سولەیمان و شەهید عبداڵەی قارەمان.

دەبێ تاخوێن دە دەمارم دایە
خۆشەویستی‌ی بکەمە سەرمایە
لەژیان کەم هەلی‌وا هەڵدەکەوێ
بۆژیان گەل لەمە قوربانی بوێ
قارەمان لەوهەلەدەرفەت دێنێ
خۆی دەفەوتێنێ ژیان دەستێنێ

* * * *

گەلی ترئەورۆ لە ئەستێرە و مانگ
بۆهەمو سەرزەوی هەڵ دێنن بانگ
کێ دڵی ژەنگی هەیە دەردەخرێ
یەکی بێگەردی لەجێ‌ی دادەنرێ
ڕێ‌ی لەسەر ئاوو هەوا کردوە گۆر
هاتن و چونی فڕۆکەو پاپۆر
دەچتە سەر مانگ و لەرێ تل‌نادا
کانگە دەردێنێ لەبن دەریا دا
کورد بەڵام هێشتە لەدەس بێگانە
خۆی ئەسیرە وەتەنی ویرانە
ماڵ‌و داهاتی بەتاڵان دەبرێ
سەری ببزێوێ قەلاچۆ دەکرێ
یان لەپای دارە بەدەست بەستراوی
یان لەبەرگوللە دەبەستن چاوی
خوێن و فرمێسک و ژیانی حەستەم
بەرهەمی کوردە لەچەرخی بیستەم

بۆ هەموکەس هەرەمەی کۆ کۆیە
بۆمە تازە هەوەڵی ڕۆ ڕۆیە

* * * *

ئەوی تێک نەشکێ بەڵام هێزی گەلە
ڕقی گەل دوژمنی خستۆتە پەلە
باوڵات داگرێ با سەر ببرێ
بازگی دایک و ساوای بدرێ
سەرەرای ئەو هەمو زوڵمە سەختە
من لەلام رێگە هەتاسەر تەختە
رۆژێ‌دێ خەنجەری گەل رادەوەشێ
زوێڵە چەرمی لەهەژار دادەبەشێ
ئەوە دەرسێکە ژیان پێ‌ی داوم
لەژیان نابێ بترسێ چاوم
مێژو رێ‌ی خۆی دەبرێ ناچتەوە پاش
ناچتەوە بن‌سەوەتە بەرخی هەراش
چەرخ ئەگەر ئێستە دژی مەدەگەرێ (١)
لاپەرێکی رەشە زو وەردە گەرێ

(١) دۆستایەتی‌شۆرشی ١١ ایلول و ئێران ببوەهۆی زەخت و چەوساندنە وەی کوردەکانی‌تری دەرەوەی عیراق لەوڵاتی خۆیان دا کە بە پشتیوانی و پشت ئەستوری‌ی ئەو شۆرشە هەستی‌نەتەوایەتیان دەرئەبری و هەروهاببوە هۆی نالەباری‌ی وەزعی کوردە ئاوارەکانی ئێران لەدەرەوە ئەویش بۆ پاراستنی بەرژە وەندی شۆرش کە ئەوکاتە تەنیا هومێدوروناکایی هەموگەلی‌کورد بو.

## پردی‌سور

پردی‌سور هێمنی جارانی نیه
ئێسته ئاژاوه له‌سه‌ر سینگی ویه
"پێیز" (١) و سه‌رکڵی لێ روخاوه
ماڵی خاپوره سه‌ری شێواوه
ده‌ستی دڵپیسێ بنی ده‌ر دێنێ
وه‌کو کوندێ له‌سه‌ری ده‌خوێنێ
داخه که‌م ئێسته له جێگه‌ی بازان
کۆنه داڵاش ده‌فرۆشن نازان
دۆسته ڕازهه‌ڵگره که‌ی ماڵی چه‌م
سینگی ئاواڵه ده‌کا نامه‌حره‌م
هاتوه لێی ببڕێ ئاوی چاو
هیند به‌دڵ بۆی ده‌گرێ پیره "گه‌ڕاو" (٢)

---

*(١) پێیز: گڵ، پایه.*
*(٢) گه‌ڕاو: ناوی کوێره‌کانیه‌کی سوێره له‌نیزیک پردی‌سور که‌ئاوی زۆر که‌مه.*

بێسەروبەر بوە داوێن و سەری
سەری تێدا چو دەگەڵ دەورو بەری
"داش‌تەمر"(١)چۆل بوە "کەوتەر"(٢) هەروا
ئاوی زۆر داری سەرەوژور دەڕوا
وەرهەمێکی زلە ژانی زۆرە
شارنەخۆش کەوتوە بەو ناسۆرە
هەر قەلە دەفرێ لەدم بەستێنی
تۆز لەجێی ڕەش بەشە هەڵ دەستێنێ
داوە دای ناوەتەوە ئەو بەندە
پێیەوە بەندە سەری جوت بەندە
هەرچی‌بیڵێ دەبێ پێی باوەڕکا
داچناویشی بەئەسرین تەرکا
"شاخی ڕەشکی" (٣) کزو داماوە لەوێ
لەسەران هەو هەوی جارانی دەوێ
"چاڵە بەفران"(٤)بەپشوی ساردو گەرم
وازی لێیە سەری باوێتە سەرم

---

(١) و (٢): داش تەمرو کەوتەر: دوگوندن لەلای سەروی سەدەی مەهاباد وەبن‌ئاوێ کەوتون.

(٣) شاخی ڕەشکی: کەوتۆتە ڕۆژ ئاوای مەهاباد، زو لەشکری مەنگوران و عەشیرەتەکانی تری کورد لەو شاخە بەرەنگاری هێزەکانی حکومەت بون و کوشتاریان زۆر لێ کردون.

(٤) چاڵە بەفران: شاخێکە کەوتۆتە باشوری مەهابادو پێش ئەوە ماشینی سەهۆڵ پەیدابێ لەوشاخە چاڵەبەفریان ڕۆ دەکردو هاوینان لەوێوە بەفر دەهات بۆ شار.

"قوڵ قوڵاغ" (١) لەوسەرەوە دەڕوانێ
لەقەڵای سارم"(٢) و"محمودکان" (٣) یێ
هەرلە"سمکۆ" وە هەتا"سارم"ی ژیر
وردە چیرۆکم ئەهێنێتەوە بیر
ناحەزی زۆربوە ئەو مەڵبەندە
زۆری چاو برسی دڵی لێی بەندە

---

(١) قوڵ قوڵاغ: شاخێکی بەرزە لەڕۆژ هەڵاتی مەهاباد.
(٢) قەڵای سارم: شاخێکە لەڕۆژ هەڵاتی مەهاباد سارم کە لە بنە ماڵەی بداغ سوڵتان بوە لەو شاخە شەڕی دەگەڵ حکومەت کردوە دەزەمانی شا اسماعیلی صفوی دا، هێزەکانی حکومەت زۆر بە شپرزەیی شکاون و پاشەکشەیان کردوە و کوژراویان زۆر داوە بویە ناوی قەڵای سارمە.
(٣) محمودکان: لەڕۆژ ئاوای مەهابادە، سمایل ئاغای سمکۆ لەوێ کوشتارە بەناوبانگەکەی لە هێزەکانی حکومەت کرد بەجۆریک کە بەسەدان کەلاک هەتاماوەیەکی زۆر هەر لەوێ مابونەوە. ئەڵێن بۆ ئەوەکە فیشەک خەسار نەبێ ڕێزی ئەکردن و هەرچەندی گوللە ئەیبڕی لێی ئەدان و بەسەریەکدا ئەی خستن.

لێرە کەس بۆ سەری پێ دەرنایە؟
مەتە ڵۆکێکە بەکەس هەڵ نایە
چەندی ڕاوچی لەپەنا ڕابردن
ڕاوی کردن دەگڵی ڕا کردن
تەرمی چەند زاڵمی ناشتبەو تەرزە
خۆشی وەک بو سەری هەروابەرزە

* * * *

## شاربەجێ ئەهێڵم

چاو گەلێ ڕوانی لەخوارو ژوری
هەر لە دڵ دەرنەچو تاسەی دوری
شار کەوازو دڵی لێ ئەستاندم
پردی سوریش وەرەزی نەشکاندم
شینی ئەوناوە هەموی جێ شینە
گەر تەڕایی هەبێ هەر ئەسرینە
نەخوررەی ئاوە لەروباری بەتاڵ
دڵ ببزوێنێ بلاوێنێ خەیاڵ
نە نەمامە نەگوڵی تیرئاوە
چەندی بۆیان دەگری سەر چاوە
نە هەڤاڵێکی دەمی دەر بەدەری
ماوە بۆی نوێ کەمەوە بیرەوەری
ئیدی ناوێستم و ڕێی خۆم دەگرم
لەسەر ئەورێیە دەڕۆم تادەمرم
لێک جیادەبنەوە دڵخواز و خەیاڵ
پێکەوە نابەنەسەر دو ئاواڵ

دڵئـەوە بەندبوە لەوجێی دەیـەوێ
وا خەیاڵیش دەگەڵـم ڕێ دەکـەوێ
گیانی شیرینی، دڵـی، دڵ خوازی
خوات دەگەڵ جارێ هەوارگەی قازی

* * * *

## گوندی بەیرەم

ڕێ بەکۆسـپ و تەگەرە و چاڵ و چۆڵ
ڕێیە ڕێبـواری دەوێ تـونـدو تـۆڵ
"قوڵ قوڵە"ی (١) بەیرەمـی وا لەوبەرزە
لەسـەری سوکە و چانێـک فـەرزە
کانیە . شینکەیـە، جێی زەنـوێـرە
تـۆزی ڕێگـا دەتەکێنـم لێـرە
دەسـترم ئـارەقـی نێـو چاوانـم
تـاوێ لـەو بەرزیەوە دەروانـم
دیمـەنـی دڵـگری دەم بـزوێنـێ
بێزمانیـش دەیـەوێ بـم دوێنـێ
دەیەوێ تـێی بگـەڕێم سـەرتاسـەر
ڕێو ڕێبـازو کـەلێـن و کەلـەبـەر
دەیـەوێ لێـم نەشکێنـم مەرجـێ
دەیـەوێ شەرتی وەفـا بێنمـە جێ

---

(١) قوڵقوڵە: ناوی کانی‌یە کە لەنیزیک گوندی بەیرەم لەبەرزیەک هەڵ ئەقوڵێ وئاوێکی زۆری هەیە.

بگرم شوێنی مەلامحمودی
ون نەکەم خوێنی "مەلا محمودی"
دڵ کە تینوش بێ نەتینوی ئاوە
چاوی خۆم چی کەمە لەو سەرچاوە
بچمە ناو سەنگەرەکەی بڕوانم
شوێنی ڕاسانی چلۆنە بزانم
دەستێ بەبرینەوە دەستێ بەتفەنگ
چۆنی جێگا بەچەتە کردبو تەنگ
چۆن دڵی دوژمنی هێنا ژانێ
دەست و بردی کوڕی لێ قە و مانێ
چەند بەمێرانی پەلاماری دەبرد
چەند بەپاکی دەبەر ئەو خاکەدەمرد
ئەو کەنەی هێشت لەچەتان هیچ دەرچن
دوایە چۆن دەرفەتی هێنا دوژمن (١)
ئەوی هات تەرمی لەوێ لابردن
چەند فڕۆکەی لەکەلاک بار کردن
کاکی!! بەوزەبرە کەوا ئالۆزا
هات بەهاواریەوە "خالۆزا" (٢)

(١) شەهید مەلا محمود لەوشەڕەدا دوژمنی شکاند وزۆری لێ کوشتن و خۆی بریندار بو کەئەو شەڕەی بەتەنیایی کرد، یەکێک لەهێزەکەی دوژمن خۆی شاردبۆوە لەبن ترومبێلێکی عەسکەری دا مەلا محمود کەلەلای وابو هەمویان کوژراون بە برینداری چوبوە شوێنێک برینەکەی ببەستێ ئەونەفەرەلەوێوە تەقەی لێکرد بو کوشتبوی.

(٢) خالۆزا: "خالْ ئۆغلی"، ناوی عەجەمێکە کە لەناو مەنگوڕان دوگوندی هەیە بەناوی بەیرەم و بەرەجۆ.

بەو تەق و تۆقە دەماری هەستا
یان لەوێ دورە پەرێز ڕاوەستا؟
کەس نەبو پێی بڵێ جاتۆش ئیدی
مەخۆ ئەونانە بەفیڕۆ چیدی
حەز دەکەم دەس بدەیە هەمبانە!
ئێرە جێی تۆ نیە "کوردوستانە"؟

* * * *

## کوێستانی سپی سەنگ

گەرچی لەش ماندوە وەستاوە سرە
پێشی ناگیرێ خەیاڵ بەرزە فرە
باهەرێمی سەرێ هەڵ نە بوێرم
دڵ گروی گرتوە با بی گێرم
رێی هەواری بگرم بچمە سەرێ
هیند بە ئەسپایی کەشەونم نەوەرێ
پشو هێدی بێ گەڵا رانەژەنێ
نێرگزی نوستو لەخەو رانەچەنێ
لوزەوی ئاوی رنو لەکوێ بێ
هێندە پێ دانەگرم شلوێ بێ
دەبێ پارێزێ بەچاو بستێنم
دەست نەبەم گوڵ نەکەمە داوێنم
سەر لەبیزا دەم و نەی بزوێنم
بۆنی شەوبو کەم و نەی شەمزێنم
هەڵزو، مەندۆک و، هەڵالەو، بەیبون
تێک نەدەم چۆنی دەبەریەک راچون

نازی شللیر بەدڵ و گیان بگرم
تیرو پڕ چاوی دەچاوی ببرم
دڵ دەڵێی شێت بوە لەوجەنگەیدا
ناسرەوێ لەوقەفەزە تەنگەی دا
کوشتمی هێندی پەری هەڵساوێ
با بەرەڵڵا بێ ئەویشم ناوێ
ڕاپەڕێ، بەربێ، قەفەزبشکێنێ
بەس لەویدا بەکزی دامێنێ
با لەبەند دەرکەوێ ئەو دێوانە
تێر بسوڕێتەوە لەو کێوانە
باڵی لێکدا لەسەران یەکدو سەرێ
لەوبنارە بەدڵیخۆی بگەڕێ
سەرێ باسەیری گەدەو(١) و ئەستەرکا(٢)
بە هەوای باڵی گوڵان پەرپەرکا
هەڵە چێشتانی هەواری مێرێ
سێبەری شۆڕەبی سەر ئەستێرێ
کەم بەڵام دێرو دەوێ ڕامێنێ
"شەنگە بێری" (٣) دڵی لێ نەستێنێ

(١) و (٢): گەدەو ئەستەر: دوکوێستانی بەناونگی کوردەوارین لەناوچەی مەنگور.
(١) لەو هەوارە دزێک دەچێتە زگ هۆبە و بیریەک کە ناوی "مێرێ" دەبێ پێ دەزانێ و دزەکە دەکوژێ و ئەو هەوارە ناوی ئەنرێ هەواری مێرێ.

هەڵ کشێ بێتە"سپی‌سەنگ" تاوێ
خۆی دەئامێزی چیاو چڕباوێ
سەرەوەی سەنگەری سەر بەرزانە
گیان لەوی چەندی بڵێی هەرزانە
هەمو جێی لاشەیە خوێنی جەرگە
لێرەیان خوێن دەستاند پێش مەرگە
لێرە توشی چەتە هات رۆژی رەش
جارێ لێ‌یان دەکەوت "پێنج و شەش"(١)
پێکەوە لێک دەدران لەو هەردە
جەندەکی جاش و سەری سەر کردە
ئێرە جێ تۆڵەیە مەیدانی گەفە
بەڵێ ئێرەش"مەتەرێزی شەرەفە"(٢)
لێرەبو کەوڵی چەتە کەوتە ڕمێن
کەوتە بەردەستی کوڕان کوردخنکێن

---

(١): لەشەری‌سپی‌سەنگ‌دا هێزەکانی حکومەت کە شکابون و خۆیان شاردبۆوە لەپاش نوێژی شێوان پێش مەرگەکان دیسان لەچەندجێ بۆسەیان بۆ دانان و بە تاریکی دەهاتنەوە بەردەستیان، عەولای معینی لەبۆسەیەک‌دا بەتەنیا دەس ڕێژێک شەش کەسی لێ بەسەریەکدا خستن بێجگە لەبۆسەکانی‌تر.

(٢): کاک‌هێمن پارچە هۆنراوە یەکی جوانی هەیە بەناوی مەتەرێزی شەرەف کەمەبەستی شەڕەکانی شۆرشی ئەودیوە.

سەری سەرباز دەبرا بێبەزەیی
خوێن لەدەم تیخی دەبانا دەمەیی
مردو نەی مابو پەژارەی زیندو
زیندو ئاواتی دەخواست بۆ مردو
لێرەبو خوێن مژی زۆڵی ناراست
سەری (١) شۆر کردەوە، ئامانی خواست

* * * *

(١) هێزەکانی حکومەت لەوشەرەدا دوای ئەوە زۆریان لێ کوژرا تەسلیمی پێش مەرگەکان بون.

## قالوێ گەور كان

چادرو چیغ هەڵ دەوەژێرم لەهەوار
وردە وردە لەهەوار دێمەخوار
ناتەنێ رێگەم ئیتر شیناوەرد
پێو پێلاوی منەو هەردو بەرد
سوكێ پەنجەم لەزەوی دا دەگرم
شاخ و كێوان دەبڕم رادەبرم
گوندی "قالوێ" دەكەوێتە سەررێم
هێشتە ڕێماوە خەیاڵ ئەدزێ لێم
ئەبێ چۆن بێ، چ دەگۆرێدابێ
ئەبێ ناوگوندەكە كێی لێ مابێ؟
باری ئەوناوە چلۆنە ئەوساڵ؟
چۆن بكەم دیتنی دۆست و ئاواڵ؟
دەوری ئاوایی ئەدەم جارو بار
لاپەڕان دادەگرم هێندێ جار
فكرم ئاڵۆزە دەگەڵ هاتو چۆ
هێندی تێكباوێ وەكو ڕایەڵ و پۆ

نە لەجێگایەکی ئۆقرە دەگری
نەڕەقەی ڕێ دەگری و ڕادەبری
هەست ئەکەم لێرە لە دەوروبەری دێ
جێی هەڤاڵانی تری پێ شکدێ
مەتەرێزێکی ترە لەو ناوە
لەو گل و دۆرە ئەوێی هەڵ ناوە
دەگەڕێ جار لەسەری جار لەبەری
هەڵی پێچاوم و دەم باتە سەری
پشتی دڕکاویە پێشی لێژە
تەموژ ! (١) لێ گەڕێ جێی دەس ڕێژە
چۆلگەیە، زورکەنە، شوێنی چاڵە
باوەشی ماوەتەوە ئاواڵە
سەنگەری "مینە شەم" و "عەولایە" (٢)
داخەکەم دەنگی کەسی لێ نایە
لەسەری بۆیە خەیاڵ شێوا بو
ببوە هەودایەک و تێک هالابو
وا نە ئارامی هەبو نە سرەوتن
زۆر تریش زۆری ئەهێنا بۆمن

(١) مەبەست لەتەموزجەوی سیاسی ی ئەوکاتەیە نەک تەموزی زەوی و هەوروهەلا .

(٢) عبدالە معینی . مینەشەمیش پێش مەرگەیەک بوکە لەگەڵ عبدالە معینی شەڕێکی زۆر پیاوانەی کرد هەتا شەهید بو .

بێم و ئاورر لە بەسەرهات دەمەوە
یادی لاوانی نەمر نوێ کەمەوە
یادی ئەودەم کە شەویش خەو لێرە
ڕێی نەبو بێتەوە چاوی سێرە
بەهەمو هێزەوە دوژمن دەبزوت
دەکەوت هێند دەسەران هەڵدەنگوت
ژەنگی خەنجەر دەسڕان لەخوێنا
خوێن کەلاک و سەری وەک یەک دێنا
تیخ کە بێزی نەدەهات نەیدەبڕی
دۆشکە دەڕشایەوە گوللە دەفڕی
بۆیە هەر بەرزە سەری ئەوکێوە
شوێنە وارێکی ئەوانی پێوە
جا خەیاڵ تۆش پەڕو باڵت دانێ
کەس ئیتر وەک من و تۆ نازانێ
کێ سەری وای هەیە بۆکەس نەنەوێ
قارەمان چۆنە ئەگەر هەڵدەکەوێ

* * * *

## شاخی حاجی کێمی

"حاجی کێمی" (۱) حەجی لێ قەوماوان
پێی غەریبانی دەنا سەر چاوان (۲)
سەری بەرزی هەیە داوێنی بڵاو
سەری ئی خۆی نەبو بۆ لێ قەوماو
سەد کەلێن و کەڵەک و داوی بو
پربەدڵ ڕازی نەدرکاوی بو
شوێنی پێی دەرنەدەخست داوێنی
سەری هەرتەم بو لەبەر چاوێنی
پوشی زەردی وەکو ئاوریشمی خاو
دای دەگرت شان و شەپیلک و سەروچاو

---

(۱) حاجیکێمی شاخێکی گەورەیە لەموکوریان چاوەی ئاوی خۆشی هەیەو گەلێکجار قاچاغ ڕوی تێدەکەن و لەوێ خۆیان ون دەکەن.

(۲) کاتێک لێرەوە هەڵاتم بۆ ئەودیو دوشەو لەو شاخە مامەوە لەسەر کانیەکەی قاچم شوشت و ئاوم لێخواردەوە و پنگەم لەسەرکانیەکە چنی.

سەیرە وا هەڵکەوێ ئەندام و لەش
فێسی وا زەرد لەسەروی "چاوی ڕەش" (۱)
داخۆ هەر داڵدەیە(۲) بۆ ئاواران
باوەشی گەرمی هەیە وەک جاران
هەر بە شانازیەوە لێی دەدوێن
باوی باڵان دەدەن و بۆی دەخوشێن
دیمەنی چۆنە وەکوخۆی ماوە
یان ئەویش پێچوە تێک چرژاوە
داخۆ ئێستەش هەموڕۆژێ لەوێ
دەنگی "پیرۆت" و "عەلی"ی(۳) دێتە گوێ
لەوهەرێمە خەوی ئارامی شەوێ
بەتەقەی "سەید فەتاح"ی دەڕەوێ
داخۆ دوژمن کەبەدویدا دەکشا
خەنجەری "عەلیەگەلە"ی چۆن دەوەشا
بیری "عوسمانی" (۴) دەکا جارو بار
ئاو لەچاوانیەوە دێتە خوار؟

(۱) قەرە گوێز: گوندێکە لەبن شاخی حاجی کێمی لە ناوچەی بۆکان، دێبوکری یە.

(۲) داڵدە: پەنا، گیاوگژوپوش.

(۳) فەقێ عەلی وەرگێڵی. سیدفتاح، پیرۆت، عەلیەگەلە، دروێش عوسمان.

(۴) ئەوپێش مەرگانە هەمویان لەشەرێکدا لەشاخی حاجی کیمی. شەهیدبون بەهۆی هێزەکانی میری کە سەرکردایەتی ی ئەوهێزانە سپهبدا ویسی ئەیکرد.

کوڕ ئەگەر نەیبێ گیانی تۆڵە
بۆبژی باب مرێ ئەو زۆڵە
ڕەنگکرا سینگ و بەری خاوێنت
شەرتە ئەمنیش بگرم داوێنت
یان لەبەرپێت دەڕژێ خوێنی من
یان دەسەرسەرتی دەگێڕم دوژمن

* * * *

## شاخی گوێزە کوێرە

لەوچەمە با لەدەراوێ بگەڕێم
بازێ باوێمەوە ئەوبەر وەپەڕێم
سەرخەوێک بەرمەوە"گوێزە کوێرە"(١)
"خەوی بێوادە"(٢) بەچاوم فێرە
شارەزام گەرچی گەلێک لەو ناوە
زۆر کەسم لێ بەتەماڵ هەڵناوە
لەو چیایە گەلێ جارم دیوە
جاش و ژاندرمە دەخوێن گەوزیوە
لێرە زۆرجار چەتەیان بۆهاتون
"حاجی پاراست" و "حوسێنی خاتون"

---

(١) گوێزە کوێرە: شاخێکە لەناو گەورکان لەپشت گوندی نستانێ.

(٢) لەوشاخە پێش مەرگە حەرەسێکیان دانابو بەناوی احمد نستانی بەڵام حەرەسەکە خەوتبوو هەتا سەرباز و جاش نەهاتنە سەریان نەیانزانی و بەوجۆرە دوپێش مەرگە شەهیدبون و حەرەسی خەوالوش خۆی ڕزگار کرد.

ئێستە هەستێکی نیە بێدەنگە
چاوی جاسوس لەخەوابێ! ڕەنگە
تاو هەڵات وەختی لەخەو هەستانێ
ڕوی ڕوانین دەکەمە "نستانێ"
باهەتاو کاتێ گزینگێ داوێ
چاوی‌لێڵم بەوێ ڕون کەم تاوێ
وامەزانە کە هەمو هەرخەوتون
کوڕی ئازای گەلێ لێ‌هەڵکەوتون

* * * *

## سپیلکی سەرشیو

سەری شێواوە"سپیلکی سەرشیو" (١)
تەم سەری گرتوە ئەودیوە و دیو
لەدڵا کۆنە برینی ماوە
لێی وەبن داوەتەوە داماوە
سەردەمێک بو سەری هیند بەبرەوبو
نەبەرۆژجێ نەشەوانەی خەوبو
سینگی مەودای هەبو بو نەسرەوتن
شانی وەک پەیژە بو بۆ سەرکەوتن
کور کەراست و چەپی ناسیبایە
سەری دنیایە بەری بۆ کایە
ئێستەوا ماوەتەوە بێ ئاواڵ
دەردی تەنیایی دەشێوێنێ خەیاڵ
نە بەرۆژدێ نەشەوانە لەسەری
دەنگی دەسرێژی"حەمەی ڕەسوەمەری"

---

(١) سپیلک: شاخێکە لەناوچەی سەردەشت لەپشت گوندی سەرشیو.

نەتەقەی گەرمە نە هاتو چۆیە
باوەشی چۆڵە سپیلک بۆیە
حەزدەکا تەم لەسەری هەر نەڕەوێ
هەر لەبن چادری ڕەش دەرنەکەوێ

* * * *

## ئەشکەوتی خەزاڵێ

رێ سەرەوژورە گەلێک بڕ ناکەم
بۆ وچان جێیەک ئەبێ پەیداکەم
لەسەر "ئەشکەوتی خەزاڵێ" (١) ش تاوێ
باخەیاڵی سەرەڕۆ خۆی باوێ
سێبەری فێنکی هەیە بۆ رێبوار
وەکو یەک ڕادەگرێ پیادەو سوار
ماڵی بۆ دەربەدەران ئەنوایە
خانە خۆیی دەربەدەری هەروایە
زگی پرسوچ و کەلێن و قوژبن
سەر بەڵام پوچەک و بێ نێوئاخن
کەچی بەوحاڵەوە چیبێتە گوێ
ئەویش ئەیڵێتەوە بۆت سەرلەنوێ
هێشتە هەرئەی لێ کە"عەوڵاناصر"
پێی لەخۆبوردنی نا ناو ئاگر

(١) ئەشکەوتی خەزاڵێ: لەئاڵوەتان ناوچەی سەردەشتە.

کاتێ وا دەستـــی لەژینـــی خۆی شــوت
چەند بەسەربەرزی دەمردو دەیگوت
حەزدەکەن نەبنە مەکۆی داخودەرد
پشت مەبەستن بە"هەڤاڵی نامەرد" (١)

* * * *

(١) عەولا ناصر لەوسەفەرەدا هەڤاڵێکی دەگەڵ بــو بەناوی "مەلاقادر لاچینی" کە ئەگەر تەقە دەس پێ کرا مەلاقادر خــۆی پێ ڕانەگیراو هەڵات و عەولاناصر بەتەنیایی شەڕی کرد هــەتــا شەهیدبو.

## "چۆمی کۆدەڵ"

"کۆدەڵ" (١) ئێستاشی سرەوتن نـاوێ
سینگ لەبەرد ئەکوتێ پریشـک داوێ
هەڵوەدا و شلوێ بەچۆڵ دا وێڵـە
چاوەهەرلێڵ و دەراو هـەر لێڵـە
ئەو کەساڵان خورو، مـەنـدو، گۆمی
قەڵپەزەی ئاوی لەمـاڵـی چـۆمـی
وتـئەزانـی کـە هەموی کـافــوره
ئێستە بەخوێنـی شەهیدان سـوره
کەفـی شێتانـە دەچێنێ و دەگەڕێ
لەتەنیشت دارو دەوەن تێدەپەڕێ
سەر بەسەر ئاودێ و خڕ دادەگـرێ
هێنـدێ دەڕوانێ لـەوێـش ڕادەبرێ

---

(١) کۆدەڵ: ناوی روبارێکە لەگوندی دارینە لەناوچەی بانە. شەریفزادە و هەڤاڵەکانی تری لەوشوێنە لەناوچەی بانـە شەهیدبون لەسەر روبارەکە.

نە"شەریفزادە" لەهیچ کوێ هەستی
دێتەوە گوێ نە"محمد ئەستی"
نە"حوسێن رابی" ئیتر لەو ناوە
هەڵمەتی نیوە شەوانی ماوە
نە لەجێیەک"عەلی عەولاکۆڵی"
ماوە هەڵ ماڵێ لەدوژمن قۆڵی
دێ و دەناڵێنێ لەدوری ئازیز
سەری شێواوی دەنێتە لم و خیز
نەدوایی دێ نەدەبڕێ شینی
وەکو کۆست کەوتە دەچێ ناڵینی
دەگەڵ ئەسرینی من ئاواڵە ئەویش
هەردولا لێڵن ئیتر بۆیە منیش
هەرچی فرمێسکێ لەچاودا ماوە
لێرە دەیڕێژمە ئەو سەرچاوە

* * * *

## گوندی دیوالآن

هەڵکشا ئیتر ئەوە زەردەی خۆر
زەردەیان گرت پەمەیی‌و ئاڵ و مۆر
با لەپێ توند کەمەوە بەن کالآن
لێرەوە سەربرە بۆ"دیوالآن" (١)
ڕێ دەگەڵ وەش گەلێ کەم مەودایە
هێندە باریکە دەڵێی هەودایە
من بە چالاکی کە وەک تاوێرم (٢)
کە دەڕۆم لێرە شەقاو دەژمێرم
لە هەر ئەشکەوت و خڕێک رادەبرم
رادەوەستم بڕێ هەست ڕادەگرم
دیمەنی جوانە بەڵام وە دیارە
ڕێی مەترسی هەیە بۆ"ئاوارە"

---

*(١) دیوالآن:* ناوی گوندێکە لەوناوچەی سەردەشت کە مەلا ئاوارە لەوێ دەس گیرکرا بەهۆی هێزەکانی میری.

*(٢) تاوێر:* ئەوبەردەیە کە لەسەری شاخەوە بەریئەدەنەوە داوێنی کێوو جاڵەی ئەکەن سەرەوژێر.

تابلێی گوندی بەداوو کەڵەکە
بەدهۆن زۆر و بەفێڵ و تەڵەکە
حەوشەیان تۆرن و ماڵیان بنەیە
هاندەری لێیە خەریکی دنەیە
زرەکوردی وەکو کەو(١) دەخوێنن
دست و دڵ پیسن و دم بە خوێنن
ناسرەون ساتێ نەرۆژێ نەشەوێ
بانگ دەکەن خۆبی ئەویش چەشنی کەوێ
دەیبەن و دەی خەنە داوی دوژمن
دێننە جێ مەرجی شەرەف دۆراندن
کوردە بۆیەک دەبنە نێچیروان
کوردنەبێ کێیترە نێچیری وان
پەت و سێدارە ئیتر هەڵ دەخرێن
لاوی تێکۆشەری پێدا دەکرێن

(١) خەڵکی گوندی دیوالان بەدرۆ نێوانی خۆیان ناخۆش کرد و مەلائاوارەیان بانگ کرد کە گۆیا پێکیان بێنێتەوە، لەبنەوەش حکومەتیان ئاگادار کرد کە دەورەی گوند بداو دەس گیری بکا، بەم جۆرە گرتیان و دایانەدەس حکومەت و دەگەڵ دو هەڤاڵی تری لەسێدارەدران لەشوێنێک بەناوی"سەرکەنەکان" لەناوچەی سەردەشت.

جارڕ دەدەن جا هەموگوندو گـەرەکـان
بێـن و ڕێیـەک بخەنە "سەرکەنەکان "(١)

بێن ببینـن کـە "شـەهید ئـاوارە"
سەری چەند بەرزە لـەسـەر سێـدارە
چۆن "حەمەد احمد" و "ڕەحمان وەتمان"
بۆوەتەن مـردن و سەریان نەچـەمان
هێشتە هەر چۆن لەگەڵـی و دارسـتـان
دەگەڕێ دەنگـی "بژی کوردوسـتـان"
گوند نیـە بنکەیـە بـۆ ئـاژاوە
خۆ فـرۆشتن لـەوێ ئێستەش مـاوە
نەتەوێی کـوردن ئەگەرچی کـوردن
لەبەرانبەر گـەلـی کـورد ڕو زەردن
نابێ دڵ خـۆش بـێ بـەوە بێگانـە
کوردی کوشتن، ئـەوە کـوردوستانـە
تـاپـتـر خوێن بـڕژێ لـەو نـاوە
شـۆرشـی گـەورەتـری بـەدواوە

* * *

(١) سەرکەنەکان: ناوی شوێنێکە لەنیزیک سەردەشت کە مەلائاوارە دەگەڵ دو هەڤاڵەکەی تری لەوێ لە سێدارە دران. هەڤاڵە کانی تری یەکیان "محمد احمد" ئەوی تر "ڕەحمان وەتمان" بو.

# ماڵ ئاوایی

ڕێ ئەوە هاتوە ببڕێ کەم کەم
ڕێی بە هەورازو نەوی و دەردوخەم
چاودەگێڕم لەچیاو ئاوایی
لەپشوی ئاخری ماڵ ئاوایی
ماچ دەکەم مستەگڵێک دوسێ جار
بەلەشم دا دێ تەزو سەرتاخوار
دەگرم ڕێی دەوەن و دەربەدەری
ڕۆژێ دێ دەربەدەریش دانێ سەری
کە دەڕۆم ڕوینەکەم نابەدڵە
شینەکەم چونکە کەت و نیوە چڵە
کوردە واری گەلی جێی وای ماوە
قارەمان گیانی لەوێ داناوە
هەن لەڕێی ئەوگەلەدا بێ سەروشوێن
چون و بۆم ڕون نەبو جێیان لەکوێن
بویە دەرفەت نەبو گشت جێیە بچم
واش لەراست وانە بەڵام ئەستۆکەچم

ئەوی لەوبارەوە ویستی خۆش بێ
گەورەیی کردوە با هەرخۆش بێ
داوی خەم گەرگوتم ئاوا بادەم
بۆیەبو دەستێ بە ئەژنۆ دادەم
لێم دەدڵنەگری دەناو گڵکۆدا
دڵی‌من شێتە دەتاسەی تۆدا
چەند بەیادی‌تۆ شەوو نیوەشەوێ
ڕاچەنی "هێدی" لەوێژینگی خەوێ
من کە ئەو چەند و شەیەم پێکەوەنا
هەر مەبەست بیرەوەری تۆبو دەنا
کارێ پێک نایە بەخۆزکەو بریا
دوژمنی پێکەنی هەرکەس گریا
کوردو پاڕانەوە شەرمە، شەرمە
دڵی ڕەق بۆدمی خەنجەر نەرمە
کەڵکی هیچ ناگرێ شین و ڕۆ ڕۆ
تۆڵە ئەستاندنە مەرجی من و تۆ

* * * *

١٩٧٢/٩/١٢ دێلزە
ناوچەی باڵەک

# "بیاد تو"

نیارم گفت باکس درد پنهانی که من دارم
ندانم راه خود را در بیابانی که من دارم
به گلزار هرکسی با لاله‌ای الفت ببست اما
ندارد کس گلی چون یارخندانی که من دارم
حدیث عشق راگفتن مجالی نیست کزحسرت
بشوید دفترم را چشم گریانی که من دارم
ترا در قلب خود جا دادم و آشفته از آنم
سرا بس تنگ باشد بهرمهمانی که من دارم
مپرس احوال زارم را زمن زانکه نمی‌گنجد
بجز در خاطرم درد فراوانی که من دارم
چوزلفت دل پریشان وچوقدت قافیه موزون
ببین طبع ودل جمع وپریشانی که من دارم
زآغوشم برفتی همچو یوسف رفت از کنعان
خدا بازآورآن یوسف به کنعانی که من دارم
زحد افزون شکستی وعده را وزمن وفا دیدی
که احسن برثبات عهد و پیمانی که من‌دارم
بدامن می‌چکد خون دل از دیده "حسامی"را
بحال خویش گرید شمع سوزانی که من دارم

شیخعلی ۲۱ اردیبهشت ماه
یکهزار و سیصد و سی شمسی

## "اشک خونین"

شد جوانی زکف وحسرت دیدار بماند
آه از این درد که بر این دل بیمار بماند

در کنار تو مرا بود دل شاد ولــی
رفت با پای تو شوق و غـم بسیار بماند

سایهٔ سرو تو تا از سرمن شد کوتاه
پای لرزان من از رفتن گلزار بماند

این عجب بین که شدم شهرهٔ عالم بجنون
لیک با تو سخن از جملهٔ اسرار بماند

صحبت از تلخی هجران تو کردم دیدم
یادگاری زمن و خامهٔ خونبار بماند

مرغ دل سوی تو پرزد قفس سینهٔ تنگ
ره پرواز بر او بست و گرفتار بماند

گفته بودی که زما یاد نکردی ایدوست
پس چرا اشک من اینگونه برخسار بماند

اشک خونین که من ازدیده روان میدارم
کاروانی است که بی‌قافله سالار بماند

تو به بیگانه نشستی و مرا چاره نبود
که گل از روز ازل در بغل خار بماند

من زرسوائی خود باک ندارم لکن
بردلم درد جدائیست که دشوار بماند

نازم آن اشک وفادار چه شب‌های دراز
که بیاد تو زچشم آمد و بیدار بماند

گلشن صحبتت ار غایت مقصود من است
آرزوئی است که در پردهٔ پندار بماند

شیخعلی خرداد ۱۳۳۵ شمسی

## "چلەی‌بارزانی"

لەمێژ نیە هەر لەوهەردە
ئاڵۆزی بو هاتوچۆ بو
تفەنگ سەرەوبن کرابون
لەبەر گریان‌و هاتو چۆ
کوردی کوردوستان جمی بو
وەک یەک لەچاوی ژن و مێر
کەهات هەواڵی جەرگ بڕ
خەفەت ئەباری لەو ناوە
ئەورۆژە باوکی خۆشەویست
هەناسەی پێش مەرگەی تۆ بو
چل رۆژ تێ پەڕی لەوکاتە
هەڵگۆردو پیرس‌و مەتین
هەڤالانی بەوەفای خۆت
کورتەی چیرۆکی ژینی تۆ
بەرهەڵستی‌ی دوژمنی کورد
بن بەردی خۆت لەشاخ وکێو
نەک هەر ڕەمزی‌کوردوستان‌بوی

لەناو ئەو زورکەن و بەردە
هەمولا شین‌و رۆ رۆ بو
سۆرانی لەخم ڎرا بون
وەک دەشتی مەحشەربو شنۆ
لەو دەوروبەرە خزی‌بو
ئەهاتەخوار فرمێسکی سوێر
باوک هۆشی‌بڕا لە کوڕ
"باوکی کورد" سەری ئەناوە
سروێک ئەهات تۆنەت‌ئەبیست
ڕوحیان لەسەر گڵکۆی تۆ بو
بەڵام کوردوستان هەر ماتە
قەندیل و کوڕەک و سەفین
ئامێزیان ئاواڵەیە بۆت
پێش مەرگێک بوی ماندوو مجرۆ
لەبێشکەدا دەستت پێ‌کرد
نەگۆڕیەوە بەزێرو زێو
بۆکورد دەرسی نەوەستان بوی

دەستی خەنجەرت بە هێزبو
سامی تۆ وای دەنگ دایەوە
لەهەڵ بەستا تۆبوی مەبەست
کاتێک لاوەیی نەتەوێ
بۆ سەر بەرزیت سەر دانوێنێ
"کردەوەی ئەو قارەمانە
ئەوەی تۆی دی لەسەنگەرێ
تۆ بوی شانازیی گەلی کورد
کۆچت دەردێکی بەسۆبو
گڵ تۆ لەدڵ دەر ناهێنێ

جێی خۆشی تۆ مەتەرێز بو
مردن لێت ئەپرینگایەوە
تۆ بەرزتربوی لە هەڵبەست
لەراپەرینی تۆ بدوێ
بڵێ و دان بەوەدا بنێ
لەدنیا بوتە ئەفسانە"
چبڵێ؟ ناوی تۆ چۆن بەرێ؟
زۆر شانازیت لەگەڵ خۆت برد
کوردوستان حەوجێی بەتۆ بو
خاکی کورد تۆ ناشەمزێنێ

دایک کور لەباوەش ئەگرێ
سەدجاریش لەبەری ئەمرێ

٥٨/١/٢١ شنۆ

## "نامەیەک بۆ کاوە" (١)

تـــا کـەنگێ زەمـانـی بـێزمـانـی
بـا بـەس بـێ وچـانـی وێـژەوانـی
ئەوسەردەمـە چـو کە دەس بەسەر بوم
بابێمـەوە سەر ڕەوەنـدی پێشـوم
زۆرداری کـە عومرێ درکـی مـن بـو
نۆبـەی منـە لـێی ببـم بـەداسـو
بچنـم گوڵـی بـێدرو ئـەوەنـدە
کـەس قیمـەتـی وان نـەزانـێ چەندە
لـەو شەو، لە مەبەستو، پیتو، ڕستە
هـەڵ بەسـتـی تەرو بەنرخ و بەستە
چی خـۆم ئەمەوێ هـەڵـی بژێـرم
بـێمـایە لـەناوی هـەڵ وەژێـرم
ئەوتۆ کـە لەدوی ببـن بە عەوداڵ
لەو هـەردو هەرێمـەدا کـوروکـاڵ
وەک شەمعی لـەرێی یـەکی بدێرن
وەک دیاریە بـۆ یـەکی بنێـرن

---

(١) کاوە: منالێکی مەکتەبیی حەوت هەشت ساڵانە، خزمیمنە، زۆر منالێکیوریاو لەلام خۆشەویستە بەو هەڵبەستە ئەمەوێ لەگەڵی بدوێمو تێی بگەیێنم کە کاوە کێیە، کورد کێیە.
ئەوهەڵبەستانە یەکەم هۆنراوەی منن کەلەدوای دەربەدەریو گەڕانەوەم بۆ ئێران گوتومن، دوای ئەوە کەانقلابی پیرۆزی ئیسلامی لەئێراندا سەرکەوتو رژیمی شای گۆربەگۆر ڕوخا، چونکە پێش تونبەتون بونی ئەو دەرفەتو مەجالی ئەم جۆرەشتە نەبو.

شەوگاری درێژ من و قولینچکێ
ڕۆژ جۆگەلە ئاوو تۆزە شینکێ
گەردەس بدەن ئەودوە هەمودەم
ئەوگەنجە بەتەختی شایی نادەم
لەولایە کەلاوی دڵ دەڕێژم
لەودەستە کەلاکی خەم دەنێژم
ماوێکە دەسی نەیاری دڵ ڕەش
ئاوا هەڵی داشتوم لەگەڵ وەش
لێتان چ نزیکم و چ دورم
هەرکوردم و هەر لەسەروە سورم
ئەورۆژە کەمن بەکوردی خوڵقام
فەخرێ بو کەکوردە واری پێیدام
بۆی کردمەوە سینگ و باوەشی خۆ
ئەودایکە منی گەیاندە ئەورۆ
ئەورۆش کە ئەڵێم لەخەڵکی شازم
هۆی هەر ئەوەیە بەکورد ئەنازم

* * * *

باوانی من و تۆ سەردەمی زو
چەکیان ئەگە بوبێ هەر گورز بو
هەر ئەو چەکە بو لە دەستی مێران
بەوگورزە ئەچونە ڕاوی شێران
گشت کاری بەدەستی وان ئەسوڕا
میریش بەقسەی ئەوان ئەگۆڕا

چی لەوگەلە کەوتەوە بەهێز بو
بەو هێزەوە ئەو گەلە بەرێز بو
لەو سەر زەوی‌یە نەبو وەکو وان
مێرخاصو(١)، بلیمەتو(٢)، دلۆوان(٣)
بەوبونەوە ناوی وان نرا کورد
ئەش زانی کە کورد یەکە لەگەڵ گورد
ئەم دەورە کە کورد کزو کەساسن
ئەمنیش و ئەتۆش بەوان ئەناسن

* * * *

ئێستەش کوری وان ئەوەندی ماون
لەو ناوچەیە بەش بەش و بڵاون
هەردوژمنی کەرتێ کەوتە دەستی
بونە هەدەفی ڕەگەز پەرستی
دەوروبەر ئەوەی لەدەستیان دێ
ماف و هەقی‌وان ئەنێنە ژێر پێ
هەرکامی لەوان سەریش هەڵێنێ
داگیرکەری ملهوڕ ئەی پەڕێنێ

* * * *

ئەوکاوە کەتۆی بەناو کراوی
کەم کوردێ هەیە نەزانێ ناوی

(١) و (٢) و (٣): ئازا. زانا. سەخی و بەدەست و دڵ.

کوردێ بو نەترس و ژیرو چالاک
تێکۆشەرو قارەمان و بێباک
ئەوکاتە دژی ستەم هەڵستا
مەردانە خەباتی کرد نەوەستا
ئەوپیاوە بەهێندێ چەرم و دارێ
"ضحاک"ی لەتەختی خستە خوارێ
گەرئەو وتە سەیرە لای تۆ کاوە
رون کردنەوە کێ لەتۆی وەچاوە
مەیدان هەیە بۆ هەموکەس ئەورۆ
نوسین لەمن، خوێندنەوەی لەسەرتۆ
کۆسپێ کەبو(١) لاچوە لەسەر رێم
دەرفەت هەیە بۆ لەگەڵ تۆ نەدوێم؟
وایدانێ کە ئەورۆ تۆ قوتابی
لێم سورە لەدەرسێ ماندونابی
گوێبگرە لەمامی خۆت کەوایە
چیرۆکە کە بابگاتە دوایە

* * * *

شای ئەودەمە ناوی ئەژدەهاک بو
شایچی؟ وەکو شێری سامناک بو

---

(١) تازە حوکمی زۆر داری شا لەئێران روخابو کە لەزەمانی ئەودا نوسین و خوێندنەوەی کوردی ئیمکانی نەبو.

نەیبو بەزەیی و روحم لەگەڵ کەس
خۆشی و دەسەڵاتی خۆی ئەویست بەس
بێجگە لەوە زوڵمی پێڕەوابو
دوماری لەشانەکان ڕوابو
جابۆ ئەوە مارەکان بژین شاد
گشت ڕۆژێ لەمێشکی ئادەمیزاد
هەردوک ئەبو تێر کرێن و مریبن
بەو خواردنە تا بخەون و کریبن
نەک برسی بن و لەبەروە شاڵاو
بۆ سەر سەری شا بەرن لەناکاو
کردی بەئەرک لەسەر هەموکەس
لەگیانی کوڕان ئیتر بشۆن دەس
هەرباوکی کوری هەبا ئەبو خۆی
هەستێ و سەرێ ئەوکورە بەرێبۆی
پێشکێشی بکا هەتا لەپاشا
مێشکی بخورێ لەکۆشکی پاشا
فیردەوسی ئەڵێ هەزارویەک ساڵ
ئەوشایە ژیا بەزوڵم و تیتاڵ
هەر ڕۆژە کوری کەسێک ئەکوژرا
بەوبونەوە جلکی ڕەش ئەپۆشرا
هەرلایە ئەچوی شەپۆرو شین بو
هەرشیوەن و ئێخە ڎادرین بو

ئەونۆبەیە هات گەیشتە کاوە
شازانی کە ئەو کوڕێکی ماوە
حەوتی‌تری بون ئەوان هەمو چون
نەی‌بو ئەوە کەڵکی گاوو گەردون
گوتیان ئەمە نابێ زۆر مناڵە
باجارێ ببێتە هەژدەساڵە
ئەوجار کەکوڕێک بو پێ‌گەیشتو
زۆر زان و بەهۆش و تێ‌گەیشتو
هاتن کە ئەویشی لێ بسێنن
بیکوژنەوە مێشکەکەی دەرێنن
"ئاسنگەری‌پیر" ئەگەر ئەمەی دی
هەرچی‌هەبو نایە لا شتی‌دی
دڵ پربو لەشاى‌و مارەکانی
خوێن ئەکوڵی لەناو دەمارەکانی
ئەوچەرمی لەخۆی ئەبەست لەسەرکار
کردی بەعەلەم لەسەر لقێک‌دار
ئەودارو شەکیلە بونە ئاڵا
ئاڵایە کە خەڵکی لێ دەهاڵا
بەوچەرمەوە کەوتە شاروبازێر
کۆی کردەوە دەوڵەمەندو وەرزێر
هاواری دەکرد کە: بۆمەشەرمە
ئەوخوێن مژە تاکوکەی لەسەرمە؟

دنیا ئــەوەتــا نوقم بــو لەخــوێــن
وەرن و هەمو دەس لەدەستی یەک نێن
ئەوشایــە لەتەختی بێننــە خــوارێ
نــازانــێ بــەشایــەتــی بچـــارێ
ئــەومەینــەتــە ئێمە بــۆ بچێــژین؟
تــاکەی ئەبــێ تەرمی کــوڕ بنێــژین؟
خەڵکیش وەکو کــاوە دڵ بــرینــدار
بگــرە لەوی تــورەتــر هەزار جــار
لێک چون و ڕژانــە کــۆشکــی شــاوە
شــایان لەوێ گــرت و خستــە لاوە
ئەوپەرچەمــە ئێستــەش ئەو زەمانــە
بــەوەوبــۆنــەوە نــاوی "کــاویــان" ە

* * * *

لــەجیاتی ئەویش گــەڕان لەئێران
یەکبێنــن و ببێتــە شــا لەسەریــان
شــازادەیــە بــو لەوێ "فــەرەیــدون"
دڵســـۆزو، بــەئــاوەزو، بــەزاکــون
ڕوژێک هــەمو چونــەلای بــەگشتــی
کــاوە لــەبــەرو خەڵــک لەپشتــی
گوتیــان ئەبــێ تــۆ ببــی بــەشامان
باشتــر لــەتــۆ کەس نیــە لەلامــان
کاتێــک بە بەڵێــن وەڵامی داوە
ئــەو گیــروگــرفتــی بــو بــڕاوە

بەم شێوەیە بوبەشا فەرەیدون
پیس و چەپەڵی وڵات لەناوچون
جێگەی شەڕی گرتەوە تەبایی
بەوبۆنەوە بو بە جێژن و شایی

* * * *

هیوام هەیە تۆش کوڕێکی ژیر بی
پسپۆڕوبە هەست و، هۆش و بیربی
هێندەی بکە بێوەخت مەچۆ خەو
بەوخەوتنە ڕۆژی خۆت مەکە شەو
بخوێنە هەتا هەلت لەدەس دا
هیچ ناکرێ کە ئەو هەلەت لەدەس‌دا
وریا بە لەخۆت کە ئەو زەمانە
دایکێکە لەبەرخی گێژ نەبانە
گوێ بگرە لەئەمری دای‌و باوان
ڕێزیان نەگری ئەبێتە تاوان
ڕێیەک مەدەبەر بەتاقی تەنیا
هەورازو نشێوی زۆرە دنیا
بۆباب کورو بۆبرا برابە
یانی کوڕی چاک چلۆنە وابە
بوکوردبژی لامەدە لەڕێ‌ی‌گەل
تۆبازی مەبە بەهاودەمی قەل

ئەو خاکەیە لێی ئەژی هەتاهەی
ئەو خەڵکە بەژێر چەپۆکی تاکەی؟
جێی خۆت بکەوە لەناو هەڤاڵان
دۆستبگرە بەڵام بە مانگ و ساڵان
دۆستێکی وەها کە بو بە هاورێت
ماڵ و سەری خۆی وەچاو نەبێ لێت
دو ڕو کە لەهەردولاوە پەستە
ڕوی تێمەکە پشتی پێ مەبەستە
تۆ هێشتە منالی نۆ جوانی
پێویستە لەئێستەوە بزانی
هەرپیاوی نەزانە ڕەنجە ڕۆیە
زانابی ژیان حەڵاڵی تۆیە

٥٨/٣/٢٥
کرج ــ عظیمیه

## "ورینگە"

هەر لە ڕێت کەوتم‌و نەم زانی لەبەرچی وایە
ڕۆژنیە ڕوی‌تۆ کەچــی چاوی لەبەر هەڵنایە
لەشی نەرمت لەو شەی ناسک ئەگەر داڕێــژم
سەدهەزار هێندی وشەی تر هەوەسی‌تــێ‌دایــە
نواندنی مەرمەڕی سینەت لە کراســی تەنکا
وەک لەرەی مانگی شەوی چاردە لەناو دەریایە
سەردەشێوێ لە خەیاڵ‌و، لەمن‌و، هەڵ بەستم
بۆنی کەزیەی تۆ ئەگەردێ بەکزەی شەوبایە
خەمی‌من بۆیە لەژێر سێبەری تۆدا دەڕەوێ
پرچی‌تۆ پــەرچــەمە باڵای‌تۆ وەکو ئــاڵایــە
مەم لەئێخەت سەری هەڵداوە ئەویش سەرتاپای
چەق‌و چۆیە، تەزووە، لەرزە، مچورکە، تایــە
کە هەنیت بسکی لەسەر لادەچێ لالەی ڕوتــە
گەردنیشت ئەگە خاڵ لێ‌بگــەڕێ مینایــە
چاوی تۆ زۆر لەئەوین ئەدوێ لەگەڵ من چبکەم
مەست ئەدرکێنێ قســەو، دوایە دەکا حاشــایە

دەمی عیسێ وەکو ئەفسانە لەلام وابـو بەڵام
کەبزەی تۆم دی منیش هاتمە سەرئەو بـڕوایـە
حەزدەکەم قەت لەسەرت کەم نەبێ مویەک چونکە
هەیە پەیوەندی لەگەڵ ژینی من ئەو هەودایـە
تاکراس دەخزێ لەسینگت مەمی تۆ دەکوشێ بەڵام
دزی خۆماڵی یە نـاگیـرێ بەهیچ دەزگـایـە
نیەوەک شیعری من ئەوڕۆ تەڕو تێـراو، ئیتر
قەدی شلکی تۆ کـە هەڵبەستی خوایـە جیـایـە
شەرم و، ئاوات و، نیازو، هەوەسـی لـێ دەرژێ
پەیکەری تۆ لەسەرو، سینگ و، کەمەر، تا پایە
هێندە شیرن ئەدوێم بۆتۆ، لەناو بێشکە (١) مەگەر
دایە بەوشێوەیە بـۆی کردبی لایـی لایـە
"هێدی" یادی دەمی تـۆی پێ نەکرا چارەچیە
خاڵەکە هێندە پچوکـە بەخەیاڵا نـایـە

عظیمیە ـ کرج
نۆی ڕەمەزانی ١٣٥٨
٥٨/٥/١٢

---

(١) بێشکە: لانک.

## "گنجینهء نهفته"

من میروم که رنگ شفق لاله‌گون کنم
من میروم که مرز وطن جوی خون کنم

من میروم که همچو عقابی به کوهسار
چنگال خشم بر جگری آزمون کنم

من میروم که رایت مجدتو ای وطن
بار دگر فراشته در تیسفون کنم

گیرم که دشمنت هوس خام پرورید
من این هوس برون زسر خصم دون کنم

وینهم رسالتی که دگر کاخی از ستم
با پایه‌های سست و کجش واژگون کنم

دشمن اگر به جادوی فرعونیان بود
من باعصا برابری آن فسون کنم

آن مکتبی که داد بمن درس مردمی
تعلیم هم بداد که ایثار چون کنم

حاشا من آن نیم بره سرفرازیت
باک از ستیزه‌جوئی خصم زبون کنم

من زادهء تو هستم و تو مام من اگر
زانچه امیدتست بمن زان فزون کنم

دیوانه‌ای نخواست اگر فرهت ترا
آن به بضربتیش رها از جنون کنم

هرجا سخن زدوست بود بانوای خویش
جانی در آن دمیده بجان اندرون کنم

شیرین من هرآینه خواهد به جلوه‌ای
نقشی دگر فزون بدل بیستون کنم

آنسان خوشم به زمزمهء خود که نیستم
پروای آنکه ساز نی و ارغنون کنم

شایستهء نثار تو گرنیست گوهری
گنجینهء نهفتهء خود را برون کنم

از بامداد شوکت تو جان سپاریت
هرکس به عصر خویش‌بکرد ، من‌کنون‌کنم

۵۹/۱۰/۱۲
عظیمیه کرج.

در روزنامهء کیهان شماره ۱۱۱۹۷ دوم بهمن ماه ۱۳۵۹ صفحه ۶ چاپ شده است.

## " یادی بارزانی "

لەدڵم دابو لەگەڵتا بدوێم
بێنمەوە گۆڕێ خەمی کۆن و نوێم
لەگزی و فێڵ و چەپۆکی زۆردار
لەگەڵی دەربەدەرو ڕوت و هەژار
هەست ئەگەر دەستێ بداتە دەستم
کاروانێ لەمەبەست ڕا بەستم
پەردە وادێن و لەلام ڕادەبرن
ئەوی دڵخوازی منن خۆ دەگرن
جا خەیاڵم ئەوێ خۆ نەبوێرێ
بێت و لەوناوە یەکێ بژمێرێ
گەر لەوە دەرفەت و مەیدانی نەبو
دەمێ بمباتەوە چاخی پێشو
سەرچیاو، ناوگەڵی یو، دارو دەوەن
ناو کەوی بەفرو، ڕنوو، لێڕو، چەمەن
هەمولا دەنگە، هەواڵە، خەبەرە
سەرچیا سەنگەرە، داوێن چەپەرە

تەقــەیە، گرمەیــە، دەس ڕێژی تفەنگ
تەم هەموجــێیە دەکاتــە شەوەزەنگ
هێرشــی پێشمەرگەیــە بــۆ سەردوژمــن
لــێی دەکاڵێتــەوە هیــێرش بــردن
سەر دەبــا گیانــی نەیــار دەستێنــێ
سەروەبــەر دوژمنــی کــورد ناهێنــێ
"هەندرێن" (١) سەنگەری ســەربەرزانە
گیان لەوێ چەنــدی بڵــێی هەرزانــە
پێکەوە لێک دەدرێن لــەو هــەردە
جەندەکــی جاش و ســەری سەر کردە
لە"کورەک" (٢) دێتە ڕژان خوێنی گەش
سێرە ناگیرێ لــەبــەر دوکەڵیڕەش
تەرمیدوژمن لەسەر ئاوی "بێخاڵ" (٣)
بۆتە چێشتان و بژیوی قــەل و داڵ
ڕۆژو شــەو لێــرە هەمو دەشــت و دەرێ
وەکویەک ئاگــری دەرژێتــە ســەرێ
لوتکەهەرسەنگــەرە دەشتهەر مەتــەرێــز
شاخ و دەشت ئەمری سەروک ئەگرێبەرێز
نەکورەک ســەر لەتەمــێ دەر دێنــێ
نە"سەفین" (٤) هەڵ دەچنــێ داوێنــێ

(١) هەندرێن. (٢) کورەک. (٣) بێخاڵ. (٤) سەفین.
هەر چواریان چیای کوردوستانی خوارون "عیراق" کەلەوچیایانــە بارزانی لەشۆرشە مەزنەکەیدا شــەری قــورســی لەگەڵ حکومەتــی بەغداکرد.

بارەگای رێبەری کورد وا لێرە
بارەگام گوت کەچی لانی شێرە
بن تەراشێکی ئەگەر ساکارە
شەرەف و گەورەیی پێوە دیارە
کام چیا بەرزە لەسەر ئەو عەرزە
سەری ئەو سەروەرە هێندە بەرزە
ئێستە دەروانم و تۆ نابینم
دێوو سۆمایم ئەبا ئەسرینم
رون نیە چاوم و لێم شێواوە
چاونەما، یان تۆ نەمای لەوناوە؟
پێم ئەڵێن بێم ئەوەساڵ نوێ بۆوە
بگرم کۆرێ بەیادی تۆوە
دێم هەتا دەستێ بەسەر خۆما دەم
تۆ لەیادم ئەچی تا یادت کەم؟
سەردەمێ بوی و بەتۆوە نازیم
تۆ کە چوی رۆیی هەمو شانازیم
بۆتۆ من هێندە نەبێ نیمە وەلام
کۆسپی رێ گەرچی گەلێک زۆرەبەلام

شەرتە من دەس لەوەفات هەڵ نەگرم
هەرلەسەر ڕێی‌تۆ بڕۆم تادەمرم

١٠/١٢/٥٩:
ساڵی دوهەمی بیرەوەری کۆچی بارزانی

## "سـرشـک"

الفت زما بریده‌اند جمله ، سوای گریستن — ما مانده‌ایم و مهر اشک و وفای گریستن

زین همره آب دیده دریغ آیدم دریغ — بسته به اشک ما است چونکه بقای گریستن

هرجا که دیدی چشم تری ساده‌اش مگیر — کوهی زغم نهفته است ورای گریستن

ارزان گمان مبر رخ ما شوید اشک ما — دادیم زانکه نور دیده بهای گریستن

من با خیال دوست دیده ببندم ، زگوشه‌ای — راهی گشاید اشک باز برای گریستن

احساس من به بیتی دو کی میشدی بیان — هر گوشه‌ای اگر نرفتی نوای گریستن

راز درون من همه یکباره گشت فاش — از خون چو دیده‌ام گذاشت بنای گریستن

آن آتشی که اشک بجان میزند مرا — برپا کند مگر بگیتی صدای گریستن

زان میدهم چوگنجی بهر دانه‌اش بها — پیغامی ازدلی است اشکی ، سوای گریستن

زیبد سرشک بر رخ فرزانه زان خدای — دیوانه را نداشته است روای گریستن

طعنه مزن بر اشک کسانی که میکنند — درد نگفتنی درمان بدوای گریستن

اشک ارنبودی گرانمایه تر زدر یتیم — بر دیده‌اش چرا نهادی خدای گریستن

صد داستان زعشق کند بازگو تـرا — اشکی زسر روان چوگشت بپای گریستن

سرگشته‌ام زبخت خویش که در صحن زندگی — ایفا نکرد خنده نقشی بجای گریستن

۶۱/۴/۱۵ – عظیمیهٔ کرج

## "سرود"

مەزرەعەی قەلبی مەویشکەئەی وەتەن کوا ئاوی تۆ ؟
بێ زەوادن ڕۆڵەکانت کوانێ شەکری خاوی تۆ ؟
زەردە ڕەنگی خونچەکانت سێبەری زوڵم و جەفا
لادە بەو هاوینە کوانێ تیشک و تینی تاوی تۆ ؟
بێ سرودی جاودانیی بولبولت بێ نەشئە بون
دەستە دەستە لاوەکانت وەک گوڵی تیراوی تۆ
لێم دەپرسێ دڵ بەدایم بۆچی سەرگەردانی تۆ؟
ژەهری تاڵیی چی دەچێژی هەرکەسە رشێواوی تۆ؟
دەردی دڵ ناکەم دەزانم دەردی بێ دەرمانی من
حەستە مەکە سبێ دەوای کاغەیری بەرزی ناوی تۆ
ئەی وەتەن کەنگێ رەوایە مەستی خەو بێ حارست
گورگی دوژمن کەوتە کۆزی مێگەلی پاراوی تۆ
شەرتە هەر خاری دڵم بێ هەرچی عەیش و شادیە
تالە دەس دەگرم وەنەوشەو سویسن و لاولاوی تۆ

دڵ ئەگەر بۆتۆ بناڵێ چۆن ئەبێ ژیربێتەوە
تا لەژێرپێیم دا دەبینێ دوژمنی خنکاوی تۆ
ئەیوەتەن گریانی تۆمەوبۆت دەڕێژم ئەشکی سور
ئیشی تۆیە زامی جەرگو شیوەنی "شێواو" ی تۆ

شامات ، شیرین
١٣٢٢ هەتاوی

## "وەڵام" (١)

برای جنوبی پەیامەکەی تۆ   گەیشتو لەدڵم هەڵستا بۆسۆ
کاتێ کە دیتم زۆر بێ قەراری   لەدەس دوژمنتە گریان و زاری
بەئاگری مەیلت کوڵی دڵەکەم   سیس بۆوە دیسان گەڵای گوڵەکەم
چونکە من خۆشم ئەزانم دیلی   ژێردەستی‌و، کزی‌و، ماتی‌و، زەلیلی
دەردی گرانە خوێناو خواردنە   گەلێک لەو وەزعە خۆشتر مردنە
بۆت گریام برام نەمکرد خودداری   فرمێسکی سورم بەجوت ئەباری
راستە کاکەگیان ئەتۆش هەر کوردی   ئەتۆش وەک‌کوردان هەر شێرمەردی
لەرابوردوەکان تۆش یادگاری   تۆش ڕۆڵەی کوردان هەڵۆی شکاری
لەرێی نیشتمان خۆت ئەکەی فیدا   بۆسەر بەخۆیی سەروماڵ وێکرا
بۆرزگاربونی زەوی‌و خاک‌و ئاو   وردەو یەخسیرت ئەنێیتە پێناو
خۆمن ئەزانم پێویستە بۆمان   تاکو ئەتوانین هەوڵ دەین بۆتان
ئەتۆش ئەزانی برایەک لەبەندا   برای‌دی نیەتی گیان لەبەدەن‌دا
ئێمە هەردوک‌لا ڕۆڵەی کوردانین   خەڵکی کوردوستان شێری ژیانین
لەشیری دایکێک گرتومانە هێز   لەئاوی شەوی کردویە پارێز

---

*(١) ئەوهەڵبەستە ئەگەرێتەوە بۆسالی ٢٤ هەتاوی ٣٩ ساڵ لەوەپێش کەلەبیرە وەرەیەکاندا رونم کردۆتەوە.*

هەردوکلا وەکیەک بۆمردن و ژینین
تۆوی یەکزەوی گوڵی با خێکین
پەروەردەی داوێن ئەو دایکە مانین
ئەرژێتە بەدەن لەیەکڕەگ خوینمان
ئەمن گەر چاوبم تۆم روناکایی
لەدڵم دەرناچێ ئاەو نالەکەت
زامێکت خستە جەرگی بە ئێشم
شەو خەوم بۆتە خەیاڵاتی تۆ
رێبەندان بەردا رێی هاتو چۆیە
بەفران بار زریان لەگەڵخۆی بەرێ
ئەوجار ڕەشەمە ڕنوی بەفرەکان
یاخۆ گۆمیلکەی ئاوی کوێستانێ
بەتیشکی تاوێ بتوێ نێتەوە
خاکەلێوەبێ بەتەپڵی شادی
پرکا لەلالە داوێنی سەحرا
هەڵاڵە زەردکا دوندی کێوەکان
بولبول بۆخونچە ببێتە چاوەش
کەوبارو کۆتر لەبن ڕەوەزدا
قاقا بخوێنن بەدەم یارەوە
بەیاریی خوای بەرزی بێهاوتا
پێش مەرگە تیپ تیپ پیادەو سوارمان
لاویشێر هەڵدر لەمردن بێباک
پاکنوکی خەنجەر ژەهری مار پێوە
یەکنەفسو ئامانج یەکدڵ یەکدینین
جەرگ‌هەڵقرچاوی شیشەو داخێکین
کە بۆرزگاریی ئەو سەرگەردانین
سەرچاوە یەکجێ بۆ رێو شوێنمان
من مێشکی سەربم ئەتوم زانایی
شکان بەتیری دوژمن باڵەکەت
نەتهێشت هۆشو دڵ نەکەم نەبێشم
لەدەورەی ئیش و بەسەرهاتی تۆ
جێگە ڕاگوێزێ لەو هەردو بۆیە
بەجوتەیارە بچنە سەفەرێ
مرواریی سەهۆڵ لەسەر بەردەکان
کەبونە بەندی بەبای زستانێ
دیسان بەهارێک بنوێ نێتەوە
بەروێکی خەندان لوتفێکی زیادی
سەرخۆش‌بێ فومری لەگەشتی مەزرا
خۆ سەوزە پۆش کەن ریزی مێوەکان
زەوی خاش خاشک بگرێتە باوەش
لەژێر لوتکەکان کێوی بەرزدا
عەتری گوڵ بۆ کەن لەگوڵزارەوە
بۆلای براکەی گیراو لەداودا
فەرماندەو گەورەو خاوەن کارمان
پیرە مێردەکان بۆ تەکبیری چاک
رادەبرین هەریەک لەدوی یەکێوە

شمشیر حەمایەڵ وەلای چەپمانە   هەرچی چەپ بڕوا بێ‌شک بزانە
ئەستۆی کەچ دەکەم بەزەبری شمشیر   جەرگی کون دەکەم بەپەیکانی تیر
دوژمن لەژێر ئەو پەنجانەی مەدا   ناچارە تەپڵی ئەمان لێ‌دەدا
گەڵباخی‌و بانەو مەریوانیەکان   سوارەی تیلەکۆو هەورامانیەکان
سنجاب‌و پاوەند ڕۆڵە شێرەکان   پڵینگی ئازا بەبر هەڵدێرەکان
خۆیان سازبکەن بۆ هاوکاری‌ی من   دوژمن بڵاو کەین وەک‌تۆوی هەرزن
تاوێ پەلامار دەبەینە هێزیان   دەگژین فەرماندەی بەقەدرو ڕێزیان
جارێ سەرنێزە حەواڵەی جەرگیان   دایک دروست‌کا کۆتەڵ لەبەرگیان
ئەوان گەڵای‌دار ئێمە بای زریان   زریان دەرفێنێ گەڵای پاییزان
ڕێوی روبەروی شێری ڕق‌هەستاو   لەسەر سینگیەتی دو دەستی وەستاو
ئاڵای سەربەستی لە هەمو لایە   هەرکوێ بڵیندو بەرزو چیایە
هەڵدەکەم دەگرم جێژنی ئازادی   بادوژمن بمرێ بەبێ مرادی

سەر شێواویەکەت ببێتە جێژن
دوژمن تاڵاوی مەرگ بچێژن

## "نەورۆز"

جێژنی کۆن و ساڵی تازەی کوردەواری هاتەوە
هاتەوە ئاگری خەباتی ئەو گەلە خۆش کاتەوە
هاتەوە جوانتر لەجاران جێژنی کاوەی قارەمان
شوێنەواری میدیا باپیرە گەورەی کوردەکان
هاتەوە بگرێتە باوەش کوردەواری سەرلەبەر
هاتەوە نەورۆزو بۆ زستانە ئیتر چارەسەر
جێژنی نەورۆزە وەتەن وا کاتی پیرۆز بایی یە
جێژنی لاوو کیژو کاڵی تۆیە رۆژی شایی یە
هەر هەڵاڵەی زەردە بۆنی دێ لەرێگەی دورەوە
هەرچڵوکی دارەزەردەی دێ بە خونچەی سورەوە
ئەو گوڵاڵە ئاڵ وسورە بولبولی سەرخۆش دەکا
چەپڵەرێزانێ لەزستان و قەلی رورەش دەکا
تا شنەی هێدی بەیان هات وهەناسەی کردەوە
بەفری لاپاڵ و ترۆپکی شاخە کانی بردەوە

زێوی ئاونگ بۆتە ملوانکەی ملی گیابەندو خاو
هەر تروسکەی دێ وەدەلەرزێ بای لەسەر بێ یاهەتاو
بەرگی زستانی لەبەرخۆی دارنی ئەورۆ زەوی
نزم و بەرزو شیوو دۆڵ و رژدو هەورازو نەوی
تا لەنەورۆزدا خەڵاتی ساڵی تازە وەرگرێ
ژەنگی داماوی و هەژاری و مەینەتی خۆی لابەرێ
پەرچەمی شۆرش خەڵاتی ئێمەیە هێناویە
پەرچەمێک بۆ ناحەزی ئەو خاکە چقڵی چاویە
پەرچەمێک تاتۆ بڵێی رەنگین و بەرزو رێک و پێک
پەرچەمێکی وا کە قوربانی نەبێ شەرمەگەلێک
چەرم و داری کاوەیە دەستی سروشت گێراویە
بەیرەقی پاراستنی ئەو خاکەیە هەرماویە
رەنگی سوری بیرەوەریە بۆ شەهیدانی وەتەن
چاوی هیوایان لەهاورێ یانە تانەی لێ دەدەن
هەوڵ و تێکۆشانی رابوردو وەبیر دێنێتەوە
خوێنی شێخ محمودە لەو سەردارە دەزروقێتەوە
من بەڵێنت پێ ئەدەم ئەورۆ لەدەنگی کوردەوە
ئەوکورەی زنجیری یەخسیری لەئەستۆ کردەوە
کۆمەڵە پێشمەرگەکەی دڵسۆزی تۆ لەستێنی تۆ
جێژنە پیرۆزەی لەسەنگەردا دەکەن بۆ خوێنی تۆ
دڵ کە رۆژوشەو دەسوتێ ئاگری تۆی تێ بەربوە
بۆیە پیاوانە لەگەڵتا مەرجی خوێنی بەستوە
باسی خوێنی پاکی تۆیەو شۆرشی رزگاریە
یان بە سەربەستی ژیان یا مردنی یەکجاریە

گەرتۆ ئەورۆ نی لەنێومانا کوری دڵسۆزی‌تۆ
هەڵگری ئاڵای خەبات‌و شۆرشی پیرۆزی تۆ
قارەمانی کوردی ئازا ماوە کاوەی بارزان
ئەوکورەکوردەی‌بناغەی‌دوژمنی‌تۆی‌هەڵوەشان
دڵ‌نیابە جێژنە پیرۆزەی دوایی نەورۆزی من
جێژنی ئازادی گەلەو سەرکەوتنی پیرۆزی‌من

لەئاهەنگی جێژنی نەورۆزی گەلالە خوێندرایەوە .

١٩٦٦/٣/٢١

# "بە یـادی تـۆ بارزانـی"

مـن دەمگوت : پێشمەرگەی چاکـم
دەمگوت : من کوردێکی ئازام
دەمگوت : سەر با لەسەردار بێ
دەمگوت : جامن بۆ بمێنـم
دەمگوت : بۆ کۆیلەی تۆ نابێ
من دەمگوت :خرمەی شەست تێران
من دەمگوت : خرەی چەخماغان
من دەمگوت : ژەنگی خەنجەران
دەمگوت :تۆهەر لەوساوە بوی
دەمگوت :سایەت باوی بەکوێ
من دەمگوت :گـەل دەگەڵ رێبەر
من دەمگوت : وەک وێژەوانـان
ئاڵقەی وا داوێمە گـوێیـان
لـەکـردەوەی قـارەمانـان
وابـێ کـورد گۆچی پێ بگـرن
ئـاگـر دەرژێنمـە هـەناوان

دەمگوت لـەمردن بـێباکـم
نـابـەزم، نـاکـەوم بـەزام
بەڵام کوردوستـان رزگاربـێ
گەرسەر بـۆ دوژمـن دانوێنـم
کەسێک هیوای بەژین مـابـێ
ناهێڵـن زرەی زنجیـران
رەواندیان خەوی وەتـاغـان
بسرن بـە خوێنـی بـەدفەڕان
پشتی گەلی چەوسـاوە بـوی
لەوی نرخی هومـا دەشکـێ
پەیمانیکـەو دەیباتـەسـەر
بەوشە رادینـم زوانـان
سەرو دەس بشکێـن لەسوێیا
پـڕدەکـەم زارو زمـانـا
نەیار لەداخانـی بمـ
دێنمەخوار ئەسرینـی چـا

# کاروانی خەیاڵ

"هێدی"

گەرم دابێ کۆڕی کوڕان ‏ کۆڕی خوێن پاکو دڵپڕان
بەزمی خاوەن بیروهەستان ‏ کۆڕی کوردوستان پەرستان
ئەوکۆڕانەی وا "شەش ساڵە" ‏ جێی تۆیان تێدا بەتاڵە
تا دەمویست ناوی تۆ بێنم ‏ دەتگوت شمشیر دەوەشێنم
لەپیتم ، لەوشەم ، لەرستەم ‏ لەشیعری گەرمم ، لەبەستەم
کوێستان ئەوتۆ گەرم دەبو ‏ گەرمین هالآوی بۆ دچو
دەمگوت چی ئەمدی چی ئەمبیست ‏ دەمگوت هەرچی دڵم دەیویست
من تۆم ئەدیو پڕبەبالآم ‏ لەبالآی خەیاڵ دەهالآم
بەرەوئامانج بیری وردم ‏ باڵی دەگرتو دەیبردم
بۆ لوتکان پەڕی هەڵداویشت ‏ کوێ بەرزبو لەوێ دەنیشت
تینی هەبو وتەوەلآم ‏ بارزانی تا تۆم بو ، بەلآم
کۆچی تۆ وای کرد لەهەستم ‏ سۆز نەما لەناو هەڵبەستم
دەی نوسم و لەبەر خۆمەوە ‏ بەفرمێسک دەی شومەوە
بێ تۆ گەرچی لەکوڵ پڕن ‏ هەناسێکی ساردو سڕن
تۆ هێزی هەست بزوێنەر بوی ‏ بۆیەش هەرئەودەم کەتۆچوی
تەڕیو تێرئاوی هۆنراوان ‏ جێیان گۆڕی هاتنە چاوان
دەبو چاو لەدڵ بتۆرێ ‏ خوێنی ئەودی لەو دەچورێ
هەردڵ دەستی کرد بەشینی ‏ چاو لێڵ دەکا تۆ نابینێ

نا نا ، چم گوت ؟ تو نەمری .
نەمدی کەس بۆ نەمر بگری .

بیرەوەری ساڵی شەشەمی کۆچی بارزانی : ١٠/١٢/٦٣ ــ عظیمیە ــ کرج

"گـــرڕۆ"

وەرە سەیری دڵی منکە چ هـــەژارو رەبـــەنـــە
گیربـــوە لەوهەڵەتو، بـــەنـــدەنو، داروددەوەنـە
مەسەلی‌کوردی هەموی راست‌و بـــەرێو جـــێیـــە
دەڵێ: هەرداری نەهاتی‌بو دەبێتە چـەقـەنـە (١)
کەدەبینی کەسی سەودای لەسەریدایە جنونیکی‌هەیە
وەرە گوێ‌بگرە لەدەردی‌دڵی، پێی پێ‌مـەکەنـــە
گەر ئەویینداری وڵاتی دەبـــێ ئاگـــــر بگـــری
ئەوە هەستێکـــە کەپێک‌نایە بەئەزمان‌و چـــەنـــە
ئەوی ئەورێگەیە دەگرێ دەبێ چەنگ‌بەخوێن بـێ
کەلکی‌کورد ناگرێ لەشی‌ناسک‌و، دەستـــی‌بەخەنـــە
گەردەترسی مەیە بەزمی‌مە ، کە ئەو مـــەیـــدانـە
پاڵەوانی دەوێ ئەورۆ شـــەڕی گیـــووپـــەشـــەنـــە
لێـــرە هەر کۆسە (٢) ترازاندنە خەنجەر سونـــە
هێرشە، دەس‌بەیەخەبـــونە، گـــەفـــی‌تـــەن‌بەتەنـــە

---

(١) چەقەنە: ئاشی‌ئاو دارێکی‌هەیە لەسەربەرداشەکـە دەی ـ بەستن هەتا ئاشەکە بگەڕێ ئەودارە وەبـــەرداشـــەکـــە دەکـــەوێ‌و تەقەتەقی لێ‌دێ‌و ئەگەرئاش‌راوەستا ئـــاشـــەوان ئـــاگـــاداردەبـــێ، بەودارەدەڵێن چەقەنە.

(٢) کۆسە: بەندی‌خەنجەرە کە لەکالانەوە لەدەسکی خەنجەر دەخرێ بۆئەوە کە نەخزێ.

«دوبرا» ڕۆژیهەرا دەسبخەنە دەستی یەک
کێهەیان باکی لەهێزی نەتەوەی نارەسەنە
گەل بەبارزانی هەتیو کەوتەوە وێڕای "هێدی"
ئەرێ کێ دیتی هەتیو کەوتنەوە لەو تەمەنە؟
کوردەواریم کەنەبێ گیانو ژیانم ناوێ
گیان ئەوە، ئەوکەنەبو بۆچی دەبێ ئەوبەدەنە
دەردی ژێردەستیە دەمکوژێ، بەسەرهاتی من
خۆ نەچیرۆکی سیامەندو، پەلی دارەبەنە (١)
پێی دەڵێم: ئەی دڵە جا لەو کەژو کێوانە بەوە
کەچی کوڵ دەیگری دەگری، دەڵێ: چبکەم وەتەنە.

عظیمیە کرج ٢٥ / ٣ / ٦٤

---

(١): خەج وسیامەند بەیتێکی فۆلکلۆری کوردیە.

"نه‌ده‌بو !"

دڵ ئه‌گه‌ر مه‌یلی به‌دڵداری نه‌دابا نه‌ده‌بو
خه‌م كراسێك بو به‌به‌ژنی نه‌بڕابا نه‌ده‌بو
مه‌ستی ئه‌وخاتره‌ی ئه‌م باته‌وه جێ‌ژوانی كۆن
به‌دزی‌بایه ده‌سم رونه‌كرابا نه‌ده‌بو
ئه‌وخه‌یاڵه‌ی له‌خه‌ویدا شه‌وێ پێی راده‌په‌ڕم
دڵی‌دێوانه به‌ڕۆژ لێی نه‌دوابا نه‌ده‌بو
پڕ له‌چیرۆكی من‌وتۆ بوه شاروباژێڕ
ئیتر ئه‌وپه‌رده بڵێی هه‌ر نه‌دڕابا نه‌ده‌بو
من له‌دوی یارو ،نه‌یاریش ئه‌وه به‌دوای‌منه‌وه
له‌و گه‌ڕابام من‌و ،ئه‌و له‌منی گه‌ڕابا نه‌ده‌بو
هێنده‌ساڵه‌ی كه‌ده‌ڵێن : كورد هه‌یه ، رزگاری‌ده‌وێ
په‌ت‌وسیداره ئه‌گه‌ر هه‌ڵ نه‌خرابا نه‌ده‌بو

---

به‌بۆنه‌ی بۆمبارانی ئوردوگای په‌ناهه‌نده
عێراقیه‌كان له‌زێوه له‌لایه‌ن فڕۆكه‌كانی
به‌عسی فاشیسته‌وه له‌هاوینی ساڵی "٤٦"دا .

کورد پەکی کەوتوە بۆدوژمنی !! دیارە بۆیە
خۆبەخۆ یەکیەتی هەبوایە تەبا با نەدەبو
ئەوی لەوخاکە چەکی بۆ گەلەکەی دەسدایە
پڕ مەترسی بو براکەم ئەگە مابا نەدەبو
سەری بۆ دوژمنەکەی شۆڕ نەدەکرد پێشمەرگە
ژن‌ومندالێ وەبەرتۆپ نەدرابا نەدەبو
کورد لەسەر مافی رەوای خوێن لەبرینی دەڕژا
دوژمنی تینو دمی پێوە نەنا با نەدەبو
ژەنگی‌هێناوە لەکالانە کەیا تێخی زوان
مشت‌و مالێک نەکرابا نەسوابا نەدەبو
خوێن‌مژی دەوروبەری تێرنەدەبون ئاخر، کورد
وەک گەلانی دی بەسەربەستی ژیابا نەدەبو
دلی کۆست کەوتە بەدەردانەوە خوێنی تێزا
چەند تنۆکێکی لەچاوم نەتکابا نەدەبو
ئەی وەتەن شەرتی مەبو "هێدی" لەبەرتۆ بمرێ
مردبایە دەبو، پەیمانی شکابا نەدەبو

عظیمیە کرج ٦٤/٤/٧

ڕێیەک مەدە بەر بە تاقی تەنیا
هەوراز و نشێوی زۆرە دنیا

بۆ کێو بڕێ لا مەدە لە ڕێی گەل
تۆ بازی مەبە بە هاودەمی قەل

١٣٦٣
ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی
ئینتیشاراتی صلاح الدینی ئەیووبی

٥٥٠ ریال
چاپ از ایرانچاپ